# نەوژین

ژمارە (٣) یەکشەممە ٢٠١٧/٢/١٩

مانگنامەیەکی تایبەتە بە پرسەکانی ژنان، رادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی NED ئەمریکی لەگەرمیان دەریدەکات




**سەلە کەلاری**

6 »»

# قەیرانی دارایی خەتەنەکردنی مێینە زیاد دەکات

■ نەوژین

**رێکخراوی وادی کەلەبواری بەرەنگاربونەوەی خەتەنەکردنی مێینە بەتایبەتی لەگەرمیان چالاکە، هۆشداری دەدات کەبەهۆی قەیرانی داراییەوە، دوبارە حاڵەتەکانی خەتەنەکردن سەرهەڵبدەنەوە.**

رێکخراوی وادی، کەرێکخراوێکی ئەڵمانیەو لەساڵی (١٩٩٥) ەوە لە هەرێمی کوردستان چالاکی کۆمەڵایەتی دەنوێنێت و بەتایبەتی لەبواری بەرەنگاربونەوەی خەتەنەکردنی مێینە چالاکە، راگەیەنراوێکی لە رۆژی جیهانی بەرەنگاربونەوەی خەتەنەکردنی مێینە بڵاوکردوەتەوە.

لە راگەیەنراوەکەدا، رێکخراوەکە هۆشداری داوە بەوەی کە سەرباری ئەوەی لەساڵانی رابردودا حاڵەتەکانی خەتەنەکردن روی لە کەمبون کردبو، بەڵام مەترسیی هەیە دوبارە سەرهەڵبداتەوە.

(وادی)، لەو روەوە دەڵێت: «بەهۆی خراپیی باری نالەباریی دارایی و ئابوریی و سیاسیی کوردستانەوە پێدەچێت مامانەکان دەست بکەنەوە بە خەتەنەوەکردنی مێینە وەکو پیشەو دابینکردنی بژێویی ژیانیان.»

دەشڵێت: خەڵک زیاتر سەرقاڵن بە کێشە سیاسی و ئابورییە «گرنگترەکانەوە»، خەتەنەکردنی مێینەش کە هەمیشە لە تاریکیدا دور لە میدیاکانو رێکخراوە خۆماڵی و جیهانیەکان و رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و دەسەڵات ئەنجامدراوە، لەوانەیە بەرەنگاربونەوەی خەتەنەکردنی مێینە و توندوتیژیی قورستر بکات.

رێکخراوەکە بەپێویستیشی دەزانێت کە بایەخی زیاتر بەو پرسە بدرێت و دەڵێت: «لەکاتی جەنگ و ململانێکاندا توندوتیژیی زیادەکات، بۆیە پێویستە هەمو بەیەکەوە دژی توندوتیژیی و بەرەنگاری خەتەنەکردنی مێینە ببنەوە.»

خەتەنەکردنی مێینە، دیاردەیەکە لەزۆرێک لە کۆمەڵگە ئیسلامیەکان و هەندێک کۆمەڵگاکانی ئەفریقیا و ئاسیا دا بونی هەیە، کە رەگێکی کۆنی هەیەو بریتییە لە بڕینی بەشێک لە کۆئەندامی زاوزێی مێینە. بەوپێیەی ئەم کارە لێکەوتەی خراپی تەندروستی و کۆمەڵایەتیی دەبێت، بۆیە نەتەوەیەکگرتوەکان هەڵمەتی زۆری بۆ بەرەنگاربونەوەو بنبڕکردنی ئەنجامداوە، لەهەولێکیشدا بەو ئاراستەیە، لەساڵی (٢٠٠٥)ەوە رۆژی ٦ی شوبات وەکو رۆژی جیهانی بەرەنگاربونەوەی خەتەنەکردنی مێینە دیارییکراوە.

لەهەرێمی کوردستانیش داو لەچوارچێوەی یاسای بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانی ژمارە (٨)، خەتەنەکردن وەکو تاوان و جۆرێک لەتوندوتیژی هەژمار کراوە و هەرکەسێک ئەنجامی بدات، سزای یاسایی دەدرێت.

لەساڵانی رابردودا، رێکخراوی وادی ئامارێکی بڵاوکردەوە لەبارەی رێژەی خەتەنەکردن لە کوردستان بەگشتی و گەرمیان بەتایبەتی، بەپێی ئامارەکە لەگەرمیان نزیکەی (٦٤٪) ژنان خەتەنەکراون، ئەمەش کاردانەوەیەکی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا. پاش چەند ساڵێک رێکخراوی (هارتلاند) راپرسیەکی لەبارەی هەمان پرس ئەنجامداو ئاماژەی بەوەکردبو کە رێژەی خەتەنەکردنی مێینە دابەزیوە.

**ژنانی گەرمیان لەشۆفێریدا پێشبڕکێی پیاوان دەکەن**

3 »»

# چێشتخانەیەک لەکەلار دەکرێتەوە ستافەکەی ژنن

■ نەوژین، سازان مستەفا

**بۆیەکەمجار لەگەرمیان، چێشتخانەیەکی کوردەواریی دەکرێتەوە کە ستافەکەی لە ژنان پێکدێت.**

(چێشتخانەی کوردەواری سیتی ئای)، ئەو چێشتخانەیەیە کەماوەی نزیکەی دو مانگە لە قەزای کەلار کراوەتەوە، ئەوەی لە چێشتخانەکانی دیکەی جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە خواردنەکانی کوردەوارییین و ستافەکەشی لە ژنان پێکدێت.

دەریا عەزیز، بەڕێوەبەری چێشتخانەکە، بە (نەوژین)ی وت: «ئەگەر چی ژنان ئەزمونێکی زۆریان هەیە لەچێشتلێنان، بەڵام کاری چێشتلێنانیان لەچێشتخانەی گشتی و دەرەوەی ماڵدا نەکردوە، هەربۆیە سەرەتا هەندێک گرفتمان هاتەرێ، بەڵام پاش ماوەیەک بەسەر گرفتەکاندا زاڵ بوین.»

وتیشی: «رۆژانە ١٢ جۆر خواردنی کوردەواریی لەچێشتخانەکەدا پێشکەشدەکرێت و خەڵکی و ئەو بیانیانەشی کەسەردانمان دەکەن، بەگشتی خۆشحاڵ و رازین لە خزمەتگوزاریی چێشتخانەکەمان».

لە ژمارەی داهاتوی (نەوژین) دا راپۆرتێک لەبارەی ئەم پرۆژەیە بڵاودەکەینەوە.

# لەگەرمیان هێنانی ژنی دوەم دەبێتەوە بە دیاردە



■ نەوژین

**پاش کەمبونەوەی حاڵەتەکانی هێنانی ژنی دوەم، لەئێستادا و بەوتەی لایەنە فەرمیەکان، جارێکی دیکە ئەو حاڵەتە لەگەرمیان رو لەزیادبونە.**

بەپێی دەقی هەموارکراوی یاسای باری کەسێتی هەرێمی کوردستان، هێنانی زیاد لەژنێک بۆپیاوان زۆر قورسکرابو، بەرادەیەک گەشتبوە ئاستی یاساغ کردن، بەڵام هەمو ئەم هەموار و یاسایانە واینەکردوە کە حاڵەتەکە بەردەوام نەبێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە لەگەرمیان حاڵەتەکە روی لە زیادبون کردوە.

بەگوێرەی ئامارێکی فەرمی بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانی لەگەرمیان، ساڵی ٢٠١٦ بە بەراورد بە ساڵی ٢٠١٥، رێژەی هێنانی ژنی دوەم لەلای پیاوان لەگەرمیان، ٢٪ زیادی کردوە.

لەمیعە محەمەد، بەرێوبەری بەرێوبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانیی لە گەرمیان، بونی رێژەیەکی زۆر ئاوارەی عەرەب بەهۆکارێکی سەرەکی زانی بۆ زیادبونی حاڵەتەکە.

ناوبراو بە (نەوژین)ی راگەیاند: « ئەوان کە خاوەن کەلتورێکن هاوسەرگیری دوەم لەلایان شتێکی زۆر ئاساییە، رۆڵیان هەبوە لە برەودان بەحاڵەتەکە لەگەرمیان».

هاوکات ژنێک کە ناوی لای (نەوژین) پارێزراوەو هاوسەرەکەی ژنی بەسەردا هێناوە، دەڵێت: «مێردەکەم قەرزێکی زۆریشی هەبوە، بەڵام شەریعەت ئاسانکاری کردوەو ژنێکی تری هێناوە».

ئەو ژنە لەبارەی رێگرە یاساییەکان بۆ هێنانی ژنی دوەم، بە رەخنەوە وتی: «بۆپیاوان یاساش بەهەمان شێوەی شەرع ئاسانکاری دەکات، یاساش هەیە رێگری لەهێنانی ژنی دوهەم دەکات بەڵام کوا جێ بەجێ دەکرێت؟»

لەلاپەڕە (٢) بەدواداچونێکی ورد لەوبارەوە دەخوێننەوە.

**ئەو ژنانەی بژێوی خێزانەکانیان لە قوڕ پەیدا دەکەن**

5 »»



**تەمەنی ١٠ ساڵەو جگەرە دەکێشێت!**

8 »»

# لەگەرمیان هێنانی ژنی دوەم دوبارە رو لە برەو دەکات

■ نەوژین،
دونیا رەحیم- ئاشنا یوسف

**دیاردەی فرە ژنی یەکێکە لەو دیاردانەی لە کۆمەڵگەی کوردی دا بە رونی بەرچاو دەکەوێ و بە پێی ئامارەکانیش بە بەراورد بە ساڵی رابردو رێژەکەی زیادی کردوە.**

سەرەڕای دەرکردنی یاسایەک تایبەت قەدەغەکردنی دیاردەی فرەژنی، بەڵام ئەم دیاردەیە و بە دیاری کراوی هێنانی ژنی دوەم لە کۆمەڵگای کوردیدا و بە تایبەتیش ناوچەی گەرمیان دیاردەیەکی بەرچاوە.

شیرین، کە ناوی خوازراوی ژنێکی ٣٥ ساڵە، یەکێکە لەو ژنانەی کە هاوسەرەکەی ژنی بەسەردا هێناوە. بۆ (نەوژین) وتی : «هێنانی ژنی دوەم زیاتر چاو لێکەری و بۆ ناو بانگە، مێردەکەم هاورێکەی ژنی دوەمی هێنا بۆیە ئەویش ژنی بەسەر مندا هێنا.»

ئاماژەی بەوەشکرد: «لەکاتێکدا من ئەوەی شەرع و کلتور بۆی داناوم درێخیم لەجێبەجێکردنی نەکردوە و بەدڵی مێردەکەمم کردوەو ئێمە کێشەو گیروگرفتمان نەبو، کەچی ئەو تەنها لەبەر حەزی خۆی ژنی بەسەرداهێنام.»

لە بارەی بژێوی ژیانیانەوە شیرین دەڵێت: «مێردەکەم قەرزێکی زۆریشی هەبوە، بەڵام شەریعەت ئاسانکاری کردوە بۆپیاوان یاساش بەهەمان شێوە، یاساش هەیە رێگری لەهێنانی ژنی دوهەم دەکات بەڵام کوا جێبەجێ دەکرێت؟»

بەشێک لەو ژنانەی ژنی دوەمیان بەسەردا دەهێنرێ گرفتی دیکەشیان روبەرو دەبێتەوە و دیارترینیشیان تەڵاق نەدانیانە لە لایەن هاوسەرەکانیانەوە.

سەبیحە ئیبراهیم، ژنێکی تەمەنی (٣٦) ساڵی دانشتوی قەزای کەلارە بە (نەوژین)ی وت: «پیاوەکەم بۆ خۆشی خۆی ژنی هێناوە و لە دوای ئەوەی ژنی دوەمی هێناوە ئێمەی بە جێهێشتوە.» دەشڵێت : «مێردەکەم کاتێک ژنی دوەمی هێنا پرسی بە من نەکردوە و ئاگام لێنەبوە، پاش ژن هێنانی منداڵەکانیشی بە جێهێشتوە و منداڵەکانی ژنەکەی تری بە خێو دەکات.»

> پیاوەکەم بۆ خۆشی ژنی هێناوە، دوای ئەوەی ژنی دوەمی هێنا ئێمەی جێهێشتوە

سەبیحە، وتیشی: «سەرەرای ئەوەی ژنی دوەمی هێناوە، تا ئێستا تەڵاق نەدراوم و سکاڵاشم تۆمار کردوە، بەڵام سودی نەبو و نەیان گرت، ئەو دەستیدەچێت و دەیناسن بۆیە نایگرن.»

جیاواز لەو گرفتانەی دێتە رێگەی ئەو ژنانەی ژنی دوەمیان بەسەردا دێت، بەشێک لە ژنان رەزامەندن لەسەر ئەو هاوسەرگیریانەو وەک خۆیان دەڵێن گرفتیان نیە.

زینەت، (٥١) ساڵ، بە (نەوژین)ی وت: «مێردەکەم ژنی دوەمی هێناوە و ئێمە هیچ کێشەیەکمان نیە، سەرەڕای هێنانی ژنی دوەم پەیوەندیمان هەرباشە.»

زینەت، رونیشیکردەوە : «خاوەنی سێ کچ و کورێکم و مێردەکەم لەگەڵ من و ژنەکەی تریشی باشە.»

سەرەڕای دەرکردنی یاسایەک تایبەت بە قەدەغەکردنی فرەژنی لە هەرێمی کوردستان، بەڵام بە هۆی نزیکی ناوچەی گەرمیان لە ناوچە کێشە لەسەرەکان، بەشێک لەو هاوسەرگیریانە لەدادگاکانی ئەو ناوچانە ئەنجام دەدرێت.

لەمیعە محەمەد، بەرێوبەری بەرێوبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانیی لە گەرمیان، بە (نەوژین)ی راگەیاند: «ئەو کێشانەی دێتە لای ئێمە ئاماژەیەکە بەوەی کەرێژەی هاوسەرگیری دوەم زیادی کردوە، ئەوەش بە هۆی بونی رێژەیەکی زۆر ئاوارەی عەرەب کەخاوەن کەلتورێکن هاوسەرگیری دوەم لەلایان شتێکی زۆر ئاساییە.»

جەختیشیکردەوە : «ئێمە ناتوانین رێگری بکەین لەهێنانی ژنی دوەم، چونکە یاسا رێگری لێنەکردوە.»

بەشێک لەو پیاوانەی هاوسەرگیری دوەم و سێیەم ئەنجام دەدەن زۆر جار «ئایین» دەکەن بە پاساو، زانایەکی ئاینیش دەڵێت : «ئەگەر پیاو نەتوانێ داوەری لە نێوانیاندا فەراهەم بکات ئەوا بۆی نیە لە ژنێک زیاتر بهێنێت.»

حەسەن سالح، هەڵگری بروانامەی دکتۆرا لە شەریعەتی ئیسلامیدا، بە (نەوژین)ی راگەیاند: «لە ئاینی ئیسلامدا پیاوان بۆیان هەیە تا چوار ژن بهێنن بەو مەرجەی پیاوەکە بتوانێ لەروی مادی معنەوی و رۆحیەوە دادوەری لەنێوانیاندا بچەسپێنێ».

بە پێی ئەو ئامارانەی دەست «نەوژین» کەوتوە رێژەی فرەژنی بە بەراورد بە ساڵی رابردو لە (٢٪) زیادی کردوە.

هیوا محەمەد، پارێزەر لەگەرمیان، لەوبارەوە بە (نەوژین)ی راگەیاند: «پیاو بۆحەزێکی کاتی خۆی رودەکاتە هێنانی ژنی دیکە، هەندێکجاریش چاولێکەرییە کە گومانی تێدا نیە ئەمەش کێشەی کۆمەڵایەتی زیاد دەکات.»

لێکەوتەیەکی دیکەی دیاردەی فرەژنی جگە لە جیابونەوەی هاوسەرەکان دروستکردنی کێشەی کۆمەڵایەتییە.

توێژەرێکی کۆمەڵایەتیش دەڵێت: «هێنانی ژنی دوەم لەکۆمەڵگای ئێمە کیشەی زۆر گەورەی ناوەتەوە.»

عەباس مەحمود، بە (نەوژین)ی وت: «ئەوئافرەتانە کەژنی دوەمیان بەسەردا دێت پەنایان بۆجیابونەوە بردوەو پاش ئەوەی یاسای باری کەسێتی لەکوردستان هەموار کرایەوە ئیستا دادگاکانی خانەقین وجەلەولا ریگەدەدەن کە پیاو ژنی دوەم بینێت.»

رونیشیدەکاتەوە: «زۆر جاریش لەدەرەوەی دادگا پەنا بۆ هێنانی ژنی دوەم دەبرێت.»

# تاقانە رێکخراوەکەی ئافرەتانی سەرقەڵا



■ نەوژین، ئومێد زەنگەنە

**ماوەی چەند ساڵێکە نوسینگەی سەرقەڵای رێکخراوی راگەیاندن و روناکبیری ئافرەتان، دور لەچاوی دەزگا راگەیاندنەکان، خزمەت بە کچان و ژنانی سنورەکە دەکات. بەرپرسی نوسینگەکەش ئاماژە بەوەدەکات ١٦ ساڵە بێدابڕان لەو بوارەدا خزمەت دەکەن.**

ئیکرامە غائب، بەرپرسی نوسینگەی سەرقەڵای رێکخراوی راگەیاندن و روناکبیری ئافرەتان، ئەوەی بە (نەوژین) وت: «نوسینگەی رێکخراوەکەمان لە ٢٠٠١/٥/١ لەناحیەی سەرقەڵا کردوەتەوە، یەکەم پرۆژەشمان بەهاوکاری رێکخراوی NPA، پرۆژەیەکی ئابوری بو بۆ بێوەژنانی سنورەکە».

سەبارەت بە ئامانجیان لە کردنەوەی نوسینگەی رێکخراوەکە لەناحیەی سەرقەڵا دا، ئیکرامە غائب، وتی: «هۆکاری سەرەکی دامەزراندنی رێکخراوەکە لە سەرقەڵادا هەڵکەوتەی جوگرافی ناحیەکەیە کەنزیکترە لە هەردو قەزای کفری و کەلار و گوندەکان، بەوپێیەی خەڵکی گوندەکان زیاتر پێویستیان بە هۆشیارکردنەوەیە لەهەردو رەگەز سەبارەت بەمافەکانیان».

ئاماژەی بە ئاستەنگی یەکەم هەنگاو و کاریان کرد و وتی: «لەسەرەتای دامەزراندنی رێکخراوەکەماندا خەڵکی ناوچەکە پێیان باش نەبو کە رێکخراوێکی لەم جۆرە لە ناوچەکەیاندا کراوەتەوە، بەڵام لەئێستادا بەهۆی کار و چالاکیەکانمانەوە خەڵکی ناحیەکە خۆیان سەردانمان دەکەن، داوادەکەن کارمان لەگەڵ بکەن بەوپێیەی کەدەزانن ریکخراوەکە بۆخزمەت گەیاندن بە هەردو رەگەز دامەزراوە».

ئەوەشیخستەرو لەکاتی کارکردنیشدا چەند جارێک توشی هەڕەشە بونەتەوە، بەڵام ئەوان هەر بەدەوام بونە.

باسیلەوەشکرد پێشتر بەتایبەتی لەبواری بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان بەهۆی نەبونی نوسینگەی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژییەوە، ئەوان لەوبوارەشدا کاریان کردوەو بەوهۆیەوە خەڵکێکی زۆر سەردانی کردون، بەڵام لەگەڵ کردنەوەی بنکەی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانی لە ناحیەکە، سەردانکردنی ئەوان کەمتر بوەتەوە.

> خەڵکی گوندەکان زیاتر پێویستیان بە هۆشیارکردنەوەیە سەبارەت بەمافەکانیان

لەبارەی هەوڵەکانیان بۆبەگژداچونەوەو کەمکردنەوەی پێشێلکاری بەرامبەر ئافرەت وبرەودان بەتوانا رۆشنبیریەکانی ئافرەتان لەسنورەکە، (ئیکرامە) دەڵێت: «پێشتر ئافرەتان ئەو پێشێلکاری و توندوتیژیانەی کەبەرامبەریان دەکرا وەک کلتورێک دەیانبینی و هۆشیاریان بەرامبەر بەمافەکانیان نەبو، بۆیە لە پێشێلکاریەکانی بەرامبەریان بێدەنگ دەبون».

ئاماژەی بەوەشکرد کەئێستا هۆشیارییەکە تارادەیەکی باش پەیدا بوە «لەئێستادا بەهۆی ئەو چالاکیانەی کەلەپێشتردا رێکخراوەکەمان بەئەنجامی گەیاندوە، ژنان باشتر دەزانن کەماف و ئەرکیان چیە، بگرە نەک بەتەنیا ژنان بەکو پیاوانیش تائاستێکی باش هۆشیاربونەتەوە، ئەگەرچی هۆشیارییەکە لەئاست خواستی ئێمەدا نییە».

زۆرجار رێکخراوەکانی ژنان بەوە تۆمەتبار دەکرێن کەتەنیا ژنان ئاگادار دەکەنەوەو پیاوانیان بەلاوە ناوە، لەکاتێکدا هەردوکیان پێویستییان بە زانینی ماف و ئەرکی یەکدی هەیە.

لەوەڵامی ئەم تێبینییەدا، بەرپرسی نوسینگەی سەرقەڵای رێکخراوی راگەیاندن و روناکبیری ئافرەتان، وتی: «بۆ هەردو رەگەز خولی هۆشیارکردنەوەمان هەبوە، چ لەناحیەی سەرقەڵا و چ لەگوندەکانی دەوروبەری، بەتایبەت لەگەڵ رێکخراوی NPA خولێکی هۆشیارییمان کردەوە کەنزیکەی ١٣٠ مامۆستاو ئەنجومەنی گوندەکانی هەرسێ ناحیەی (سەرقەڵا، ئاوەسپی و نەوجول) تێیدا بەشداربون، وانەکانیش تایبەت بون بە هۆشیاری تەندروستی و یاسایی و جێندەریی و سێکسی و خێزانی و پەروەردەیی و کێشە کۆمەڵایەتییەکان».

نەیشاردەوە کە هێشتا هۆشیارکردنەوەی تاکەکان پێویستی بە کاری زیاترهەیە بەتایبەت لەرێگای دەزگا میدیاییەکان و سۆسیال میدیاوە.

سەبارەت بە رۆڵی رێکخراوەکەیان لەکەمکردنەوەی توندوتیژی و ئەوپێشێلکاریانەی کەبەرامبەر بەئافرەتان دەکرێت لەسنورەکەدا، ئیکرامە غائب، وتی: «توانیومانە رۆڵی کاریگەرمان هەبێت لەبەگژداچونەوەی ئەوپێشێلکاریانەی کە بەرامبەر بەئافرەتانی سنورەکە دەکرێت، بەتایبەت لەماوەکانی رابردودا کەیسی هەندێک ئافرەتمان چارەسەرکردوە و بەدەنگیانەوەچوین کە لەئێستا خۆیان لە رێکخراوی دیکەی بواری ئافرەتاندا کاردەکەن و بەدەنگ ئافرەتانی دیکەوە دەچن».

وەک هەمو سێکتەر و رێکخراوەکانی دیکەش، تاکە رێکخراوەکەی ژنان لە سەرقەڵا، بەکاریگەری قەیرانی دارایی، زۆرێک لەکارەکانی وەستاوە. بەرپرسی نوسینگەکە وتی: «قەیرانی دارایی لەئێستادا کاریگەری زۆری لەسەر کارو چالاکیەکانمان هەبوە، ناتوانین وەکپێویست خزمەت بە کچان و ئافرەتانی سنورەکە بکەین».

# ژنانی گەرمیان لەشۆفێریدا پێشبڕکێی پیاوان دەکەن

■ نەوژین، پەیام جەمال

**دەرهێنانی مۆڵەتی شۆفێری لە لایەن ئافرەتانەوە لە گەرمیان ڕو لە زیاد بونەوە بەشێک لە ئافرەتانیش بە پێویستی دەزانن هاوشانی پیاوان شۆفێری بکەن.**



پێشتر و بە هۆی زاڵبونی کلتورەوە شۆفێری کردنی ئافرەتان وەکو پێویست نەبو، بەڵام لە ئێستادا شۆفێری کردنی ئافرەتان وەکو دیاردەیەکی ئاسایی تەماشا دەکرێت.

نەسرین حەمید، یەکێکە لەو ئافرەتانەی لە ئێستادا سەرقاڵی دەرهێنانی مۆڵەتی شۆفێرییە، بۆ (نەوژین) وتی: «سودی زۆرم لە بەشداریکردن لەم خولە وەرگرتوە و ئەو ڕێنمایانەی کە پێشتر نەم دەزانی ئێستا فێری بوم.»

نەسرین، وتیشی: «هیچ ترسێکم لە شۆفێری نیە و بە باشی فێربوم کە مۆڵەتەکەم وەرگرت دەست دەکەم بە شۆفێری.»

بەشێک لە ئافرەتان پێیانوایە دەتوانن هاوشانی پیاوان شۆفێری بکەن و دەڵێن: «ئافرەت بین یا پیاو خودا وەکو یەک هێزی پێداوین».

سازان ئیبراهیم، کە بەشداری خولی فێربونی شۆفێری کردوە، بۆ (نەوژین) وتی : «دەرهێنانی مۆڵەتی شۆفێری پێویستە بۆیە بەشداری ئەم خولەم کردوە و ئافرەت و پیاو هیچ جیاوازیەکیان نیە و خودا وەکو یەک هێزی پێداوین.»

دەشڵێت: «هەندێکجار ئافرەتان لە پیاوان وریاترن چونکە پیاوان توڕە ترن و سەبریان کەمترە.»

بە پێی ئامارێکی بەڕێوبەرایەتی هاتوچۆی گەرمیان کە بە (نەوژین) دراوە، (٤١٣) ئافرەت لە ماوەی ساڵی (٢٠١٦) دا مۆڵەتی شۆفێریان بەدەستهێناوە کە ٧ لەو ژنانە مۆڵەتەکانیان گشتییە.

یوسرا محەمەد، یەکێکی دیکەیە لەو ئافرەتانەی سەرقاڵی دەرهێنانی خولی شۆفێرییە. بە (نەوژین)ی وت: «هەرچەندە ئافرەتی ماڵەوەم، بەڵام دەرهێنانی مۆڵەتی شۆفێری بە پێویست دەزانم.»

ئاماژە بەوەشدەکات: «نابێ ئافرەتان تەنها مۆڵەت دەربهێنن، بەڵکو پێویستە بە کاریشی بێنن.»

بە پێچەوانەی ئەو بۆچونانەی کە فێربونی ئافرەتان بە قورس وەسفدەکەن، ڕاهێنەرێکی خولی شۆفێری پێیوایە ئافرەتان وریان لە شۆفێریدا و حەزیان لە فێربونە.

سیروان محەمەد، ڕاهێنەر لە نوسینگەی گەرمیان بۆ شۆفێری، بۆ (نەوژین) وتی: «ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتان سەردانمان دەکەن بۆ دەرهێنانی مۆڵەت و زۆرینەشیان حەزێکی زۆریان بۆ فێربون هەیە.»

> (٤١٣) ئافرەت لە (٢٠١٦) دا مۆڵەتی شۆفێریان بەدەستهێناوە

جەختیشیکردەوە : «بەردەوام بە فێرخوازەکان دەڵێین بە ڕێزەوە لە شۆفێرانی دیکە و بە تایبەت ئافرەتان بروانن، چونکە بەشێکی گرنگی شۆفێری بریتیە لە ڕەوشت.»

هەندێکجار هاتنە دەرەوەی ئافرەت دەبەسترێتەوە بە ئاینەوە و بەم پاساوەش ڕێگری لە چالاکی و بەشداری ژنان دەکرێت، بەڵام شارەزایەکی شەریعەتی ئیسلامی دەڵێت: «ئەگەر مەرجە شەرعیەکان لە کاتی هاتنە دەرەوەدا ڕەچاو بکات هیچ لە باشی ئافرەت کەم ناکاتەوە.»

د. عومەر محەمەد، کە دکتۆرای لە شەریعەتی ئیسلامیدا هەیە، بۆ (نەوژین) وتی: «ئەگەر ئافرەت ئۆتۆمبیل بە پێی پێویست بە کار بهێنێت و لێهاتویی لێخورینی هەبێت و مەرجە شەرعیەکانی تیا بێت لە باشی ئافرەت کەم ناکاتەوە.»

---

# تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان... مەیدانێک بۆ لەخشتەبردنی کچان

■ نەوژین،
زریان محەمەد – جوانە جەلیل

**حاڵەتەکانی بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بۆ لە خشتەبردنی کچان لەگەرمیان پەرەدەسێنێت، چالاکوانێک باس لەوەدەکات تەنها لە یەک هەفتەدا سێ کێشەی لەوشێوەیەیان بۆ هاتوە، پۆلیسیش ڕایدەگەیەنێت ساڵی پار بەبەراورد بە پێرار، ڕێژەی تاوانەکانی پەیوەندیدار بە ئامێرەکانی پەیوەندیکردنەوە زیاتر بون.**




لەگەڵ هەڵکشانی بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، ڕێژەی ئەو تاوانانەش کەلەم ڕێگەیەوە دەکرێت، زیادی کردوە، بەتایبەتی بەکارهێنان و ئیستغلالکردنی کچان و ژنان.

بەگوێرەی بەدواداچونەکانی (نەوژین)، ژمارەیەک کچ لەگەرمیان لەڕێگەی ئەم تۆڕانەوە بەتایبەتی فەیسبوک لەخشتەبراون و دواتر دژیان بەکارهێنراوەتەوە، کوڕانێک بەناوی پەیوەندی خۆشیەویستییەوە لێیان نزیک دەبنەوەو دواتر وێنەو دیکۆمێنتەکانیان دژ بەکاردەهێنن، لەبەرامبەر وەرگرتنی پارە یان داواکاری دیکە.

کچێکی تەمەن (٢٠) ساڵ کە دانیشتوی ناوچەیەکی گەرمیانەو لەبەر هەستیاری بابەتەکە ئامارەمان بەناوی نەکردوە، خوێندکاری زانکۆیە. ئەو یەکێکە لە قوربانیانی ئەم تۆڕانە.

کچەکە ئاماژەی بەوەکرد: لەڕێگەی فەیسبوکەوە کوڕێکی ناسییەوەو پەیوەندیان بەرەوپێشەوە چوە، تا ئەوەی ببن بەخۆشەویستی «دڵدار» یەکتر . دوای ئەوەی متمانە بە کوڕەکە دەکات، وێنەی بۆ دەنێرێت، بەڵام پاش ماوەیەک، کوڕەکە وێنەکانی دژ بەکاردەهێنێتەوە.

ئەو کچە وتی: «کوڕەکە داوای پارەی کردوە ئەگینا وێنەکانم بڵاودەکاتەوە، منیش لەترسی شکۆی خۆم و خێزانم، لە خەرجیی خۆم گرتەوەو پارەیەکی زۆرم پێدا».

چیرۆکی ئەو کچە، لەبەردەست بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانی لەگەرمیان بو، کە ئەوان وەکو لایەنێکی پەیوەندیدار بە پرسەکانی ژنان و خێزانەوە، بەدواداچون لەو پرسانە دەکەن.

عەقید لەمیعە محەمەد، بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتییەکە، لەوبارەوە وتی: «بەداخەوە خراپ بەکارهێنانی ئامێرەکانی پەیوەندی بەتایبەت (فیسبوک) ڕوی لەزیاد بون کردوە بەتایبەت لە نێوان خوێندکاران و تازە پێگەیشتواندا».

ئاماژەی دا «سەرەڕای ئەنجامدانی چەندین کۆڕ و سیمینار و چالاکی هۆشیارکردنەوە لە مەترسیەکانی ئەم حاڵەتە، بەڵام تائێستاش بەردەوامیی هەیە».

پارێزەرێکیش، ئاماژە بەوەدەکات کە ئەو کێشانەی کە پەیوەندیدارن بە ئامێرەکانی پەیوەندیکردن و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، هێندە زۆر بون کە بون بە کەیسێکی ڕۆژانە لە دادگاکاندا.

بەناز محەمەد، پارێزەر لە گەرمیان، بە (نەوژین)ی وت: «خراپ بەکارهێنانی تورەکۆمەڵایەتییەکان تایبەت نیە بە ناوچەو شارێکی دیاریکراوەوە، بەڵکو لە هەرێمی کوردستان بە گشتی بونی هەیەو ناوچەی گەرمیانیش بەدەرنیە لەم دیاردەیە».

ئەو پارێزەرە، هۆکاری ئەم حاڵەتەی گەڕاندەوە بۆ کەمی ئاستی هۆشیاری تاکەکان و بەتایبەت تازەپێگەیشتوان.

ئاماژەی بەوەشکرد کە حاڵەتەکە بەرادەیەک زیادی کردوە، کە «لە دادگاکاندا بوەتە کەیسێکی ڕۆژانە و کەم ڕۆژ هەیە حاڵەتی لەم جۆرە نەهێنرێتە دادگا».

زۆرجار لەم کەیسانەدا کوڕان بە تۆمەتبار و تاوانباری سەرەکی دادەنرێن، بەوەی متمانەو خۆشەویستی کچان دەقۆزنەوەو لەخشتەیان دەبەن.

(ک)، پیتی یەکەمی ناوی کچێکە، پاش ئەوەی لەڕێگەی فەیسبوکەوە ئاشنایەکی لەگەڵ کوڕێکدا پەیدا دەکات، وێنەی جیاوازی خۆی بۆ دەنێرێت، بەڵام پاش ماوەیەک کوڕەکە ئیبتزازی دەکات و پێیدەڵێت ئەگەر پارەم پێنەدەی، ئەوا وێنەکەت بڵاو دەکەمەوە.

ئەو کچە بەوپێیەی کچی ماڵەوەیە، بەهۆی ئەوەی هیچ سەرچاوەیەکی داهاتی نییە، بۆیەو بۆ ڕازیکردنی کوڕەکە، پەنا دەباتە بەر قەرز کردن.

ئەگەر چی بەپێی ماددەی (٢) یاسای پەیوەندییەکان، سزای توند بۆ ئەو کەسانە دانراوە کە کاری نەشیاو لەم ڕێگەیەوە ئەنجام دەدەن، بەڵام بەپێی ئامارەکانی پۆلیسی گەرمیان ئەم حاڵەتە ڕوی لە هەڵکشان کردوەو جیاواز لە ساڵی پار (٢٢) حاڵەت زیادی کردوە.

وتەبێژی پۆلیسی گەرمیان، ڕائید عەلی جەمال، لەوبارەوە بە (نەوژین)ی وت: «بەهۆی خراپ بەکارهێنانی ئامێرەکانی پەیوەندیکردن و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان، چەندین کەس لەلایەن دادگاوە سزادراون و ئێستا لە بەندیخانەدان».

وتیشی: «بەپێی مادەی ٢ی یاسای پەیوەندییەکان، سزای بەند کردن لەسەر ئەم پرسە لە ١ ساڵەوە بۆ ٥ ساڵە، سزای ماددیش لە١ملیۆنەوە بۆ ٥ ملیۆن دینار دەستپێدەکات و چۆنیەتی سزاکەش لەلایەن دادگاوە بڕیاری لەسەر دەدرێت».

بەڵام کێشەی ئەم کەیسانە ئەوەیە خاوەنەکانی کە کچانن، ناتوانن سکاڵا تۆمار بکەن، چونکە بە تۆمارکردنی سکاڵا، کەیسەکەیان ئاشکرا دەبێت و ئەوکات ڕوبەڕوی مەترسی گەورەتر و شکاندنی ناوبانگی کەسیی و خێزانیی دەبنەوە.

چالاکوانێک ئاماژە بەوەدەکات، زۆربەی ئەو کچانەی توشی ئەم کێشانە دەبن پەنا نابەنە بەر دادگا و پۆلیس، بۆیە زۆربەی کات بکەری ئەم تاوانانە ڕوبەڕوی یاسا ناکرێنەوە.

ڤیان سابر، کە چەند ساڵیکە لە بواری ژنان دا کاردەکات، بۆ (نەوژین) وتی: «چەندین کچ پەنای بۆ ئێمە هێناوە، تەنانەت لە یەک هەفتەدا سێ کەیسی لەوشێوەیەمان هاتە بەردەست، بەڵام بە هۆی بونی مەترسی لەسەر ژیانی کچەکان بە ناچاری کێشەکەیان بە داخراوی و لەدەرەوەی دادگا چارەسەر کراوەو زۆرجاریش تاوانبارەکان ڕزگاریان بوە».

وتیشی: «هەربۆیە کچان دەبێت لە مامەڵەکردن لەگەڵ تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دا وشیار بن، هەرگیز متمانەی تەواو بە کەسانێک نەکەن کە نایان ناسن، چونکە بەوهۆیەوە ڕەنگە توشی کێشەبن و زۆرجار لەو ڕێگەیەوە لەخشتە دەبرێن وەک ئەو کچانەی دۆسیەکانیان لەلای ئێمەیە».

### ئەو ژنانەی تەمەن نابێتە ڕێگر لەبەردەم خوێندن و فێربونیان دا

# ژمارەیەکی زۆر لە کچان و ژنانی بەتەمەنی گەرمیان دەگەڕێنەوە بۆ تەواوکردنی خوێندن

**■ نەوژین، پەیام لەتیف**

**ئەگەرچی تەمەنی ٦٠ساڵی تێپەڕاندوە، بەڵام ئێستاش هەمان دڵی کچێکی تازەپێگەیشتوی هەیە بۆ خوێندن. ئەو هەمو ڕۆژ بە حەماس و دڵگەرمییەکی زۆرەوە، پێداویستیەکانی قوتابخانە هەڵدەگرێت و لەپۆلەکاندا ئامادە دەبێت، بۆ ئەوەی فێری خوێندنەوەو نوسین و ئەو بابەتانە بێت کەلە قوتابخانەدا دەخرێتە پێش خوێندکار.**

ڕەسمیە میرزا، (٦٣) ساڵ، ماوەی سێ ساڵە لەبنکەی ماردینی ژنان لەکەلار دەخوێنێت، هاوسەرگیری کردوەو خاوەنی منداڵە. دەڵێت: «پێشتر هیچم نەدەزانی، کاتێک ڕۆشتوم بۆشوێنێک چەندینجار ڕێگام لێ ونبوە بەهۆی نەخوێندەوارییەوە، بەڵام ئێستا زۆرباشم و بڕۆم بۆ هەر شوێنێک کێشەم نیە».

ئەگەر لە رابردودا ژمارەی قوتابخانەکان زۆر کەم بێت و ئاستی ڕۆشنبیری خێزانەکان وەکپێویست نەبێت و ڕێگریان لەکچەکانیان کردبێت بخوێنن، بەڵام ئێستا ئەوانەشی تەمەنیان هەیە دەستیان بەخوێندن کردوە.

لەئێستاشدا چەندین قوتابخانەو بنکەی خوێندنی خێرا بەمەبەستی نەهێشتنی نەخوێندەواری و تەواوکردنی خوێندن بۆ ئەو هاوڵاتیانەی تەمەنیان هەڵکشاوە، لەلایەن وەزارەتی پەروەردە لەهەمو کوردستان دانراوە، لەنێویشیاندا گەرمیان.

بەشێک لەو ئافرەتانە هەر لەڕێگەی خوێندنی خێراوە توانیویانە چەندین قۆناغی خوێندن ببڕن.

رابیعە فەقێ مەحمود، (٣٨) ساڵ، لەپۆلی نۆیە لەقوتابخانەی گەلاوێژی بنەڕەتی ئێوارانی کچان، دەڵێت: «هەر لەڕێگەی خوێندنی خێراوە توانیومە بگەمە ئەم قۆناغە، دەمەوێت بەردەوامبم تا بڕوانامە بەدەست دەهێنم».

وتیشی: «هیوادارم ئەم خوێندنی خێرایە بەردەوام بێت، چونکە بۆ ئەو ئافرەتانەی نەخوێندەوارن زۆرباشە، مامۆستاکانیش زۆرباش وبەڕێزن لەهەمو رویەکەو هاوکاریمان دەکەن».

هەندێکجار لەخێزانێکدا چەندین کەسیان دەستیان بەخوێندن کردوە لە ناوەندەکانی فێربونی خێرا.

(فەوزیە قادر)، (٥٥) ساڵ، لەگەڵ کچەکەی دەستیان بەخوێندن کردوە. ئەمساڵ یەکەم ساڵیانە لەقوتابخانە، دەڵێت: «بۆ رزگاربون لەدەست نەخوێندەواری دەستم بەخوێندن کردوە، بەردەوامدەبم تا فێربون.»

مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ژنانەی تەمەنیان هەیە جیاوازە لەمامەڵەکردن لەگەڵ قوتابیەکی قوتابخانە، چ لە روی فێربونەوە بێت یان هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیاندا.

شوکریە محەمەد، مامۆستا لەخوێندنی خێرا لەکەلار، دەڵێت: «دەبێت لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم کچ و ژنانە وەکو هاوڕێ بیت». وتیشی: «ئەوکچانەی تەمەنیان گەورەیە، زۆر بەپەرۆشن بۆ خوێندن و فێربون، خوێندکار هەیە هەر لەڕێگەی خوێندنی خێراوە ئێستا پەیمانگای تەواوکردوە».

بەپێی ئەو پەیڕەوەی بۆ کاری ناوەندەکانی خوێندنی خێرا دانراوە، هەر ئافرەتێک تەمەنی لە ٢٠ ساڵ بەرەوسەرەوە بێت، وەردەگیرێت.

جاسم محەمەد، بەڕێوبەری بنکەی ماردینی ژنان بۆ خوێندنی خێرا لەگەرمیان، بۆ (نەوژین) ئەوەی خستە رو کە ئافرەتی تەمەن گەورە زۆرن کە لایان دەخوێنن و بەپەرۆشەوە ئامادەن بۆ فێربونی خوێندن و خوێندەواریی. وتیشی: «هەندێک ئافرەت نەخۆشی وگرێی دەرونیان هەبوە، بەڵام دوای هاتنیان بۆ ئێرە بەتەواوی چاکبونەتەوەو تەنانەت هاوسەرگیریشیان کردوە».

لایخۆشیەوە یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی گەرمیان، ئاماژە بەوەدەکات کە خوێندنی خێرا لەلای ئەوان بۆ هەر رەگەزێک، جیاکراوەتەوە بۆ دو ئاست، واتا ئەوانەی تەمەنیان لەخواروی ٢٤ ساڵ بێت، دەخرێنە قوتابخانەکان و ئەوانەشی سەروتر بێت دەخرێنە بنکەکان.

عەدنان گەرمکی، بۆ (نەوژین) رونیکردەوە: «لە سنوری گەرمیان نزیکەی (١٥) قوتابخانەو بنکەی خوێندنی خێرا بۆ هەردو رەگەز هەیە، کە ئەوانیش بەپێی سیستەمێک فێرخواز وەردەگرن، بەشێوەیەک هەمو کەسێک چ نێر چ مێ، بەگوێرەی تەمەن و ئاستی خوێندەواریەکەی، دەخرێنە قۆناغ و بنکەو قوتابخانەکانەوە.»

زۆرجار ئەو ئافرەتانەی تەمەنێکیان هەیەو دەست بەخوێندن دەکەنەوە، روبەڕوی تانەو تەشەری کۆمەڵگا دەبنەوە.

وەک (رابیعە) دەڵێت: «زۆرجار پێم دەڵێن تۆ بۆچی دەخوێنیت؟ دەتەوێت ببیتە دکتۆر یان مامۆستا؟ بەڵام من بەهیچ جۆرێک گوێ بەو قسانە نادەم و بەردەوامدەبم لەخوێندن چونکە ئەمە ئاواتی منە».

(رەسمیە)ش، بە پێداگیرییەوە وتی: «دەمەوێت تا توانام مابێت لەخوێندن بەردەوامبم.»



---

# بەزمانی خۆیان ناتوانن بخوێنن!

### فێرخوازە ئاوارەکان لە قوتابخانەدا روبەروی ئاستەنگ دەبنەوە



> هیچ هاوکاری نەکراوم زمانی کوردی فێربم

> گواستنەوەی خوێندن لە عەرەبیەوە بۆ کوردی ئاسان نیە

**■ نەوژین، ئاشنا یوسف**

**ئەگەر بۆ زۆرێک لەو کەسانەی کەبەهۆی رەوشی جیاوازی ژیان و ئاسایشەوە ئاوارەی سنورەکانی هەرێمی کوردستان بون، کێشەکان یەک جۆر بن، ئەوا بۆ خوێندکارانی ئاوارە، کێشەکان چەندین جۆر و ئاستن. ئەوان لەلایەک رو لە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی دەکەن کە زۆرینەیان پێشتر تیایدا نەژیاون، هەروەک بەزمانێکیش درێژە بەخوێندن دەدەن، کەپێشتر پێی رانەهێنراون، ئەمەش روبەڕوی ئاستەنگ و تەنانەت بارێکی دەرونی خراپیشی کردون.**

بەشێک لەو ئاوارە کوردانەی لە ساڵانی رابردودا هاتونەتەوە بۆ کوردستان، لەئێستاداو لەناوەندەکانی خوێندن، روبەروی ئاستەنگ و گرفتێکی زۆر دەبنەوە، کەدیارترینیان گرفتی زمانە.

ئەوان ئەگەرچی کوردن و دەتوانن بە کوردی قسە بکەن، بەڵام بەوهۆیەی خوێندنیان بە زمانی عەرەبی بوە، کە لەگەڵ خێزانەکانیان دا هاتونەتە هەرێمی کوردستان، روبەروی ئاستەنگ بونەتەوە.

(د.ک.ع)، (١٨) ساڵ، پێشتر دانیشتوی شاری بەغداد بوە و ئێستا دانیشتوی قەزای کەلارە. بۆ (نەوژین) وتی: «یانزە ساڵە هاتوینەتە کەلار و لەسەرەتاوە توشی زۆر کێشەو ئاستەنگ دەبوینەوە لەخوێندن دا، چونکە رانەهاتبوین بە زمانی کوردی بخوێنین».

ئەو ئاماژەی بەوەشکرد کە لەگەڵ ئەوەشدا بەشی پێویست هاوکاریی نەکراون بۆ فێربونی زمانی کوردی، بەڵام بەپشتیوانی هاوڕێکانیان توانیویانە بەسەر ئەو کۆسپەدا زاڵ بن.

ئاسیا فازڵ، (٢٠) ساڵ، یەکێکی ترە لەو خوێندکارانەی لە ناوچەکانی دیکەی عێراقەوە بۆ گەرمیان گەڕاونەتەوە. بۆ (نەوژین) وتی : «سێ ساڵە هاتوینەتەوە کوردستان و ئێستا پۆلی دوانزەم لەبەر ئەوەی بەعەرەبی خوێندومە، کێشەی خوێندن و تێنەگەیشتنم بۆ دروست بوە.»

ئاماژەی بەوەشکرد: «بە هۆی ئەوەی هیچ هاوکاری نەکراوم زمانی کوردی فێربم حەزدەکەم بگەڕێمەوە جێگەی خۆم.»

ئەو بێزاریەی کە (ئاسیا) توشی بوە، بەرای توێژەرێکی کۆمەڵایەتیی، حاڵەتێکی چاوەڕوانکراوە، چونکە کاتێک مرۆڤ لە جێگەیەکدا بەشی پێویست ناچێتە پێشەوە، بۆیە روبەروی گرفتی دەرونی و بێزار بون دەبێت.

سادق محەمەد، توێژەری کۆمەڵایەتی، بە (نەوژین)ی وت: «گواستنەوەی خوێندکار لەخوێندنی عەرەبیەوە بۆ خوێندنی کوردی ئاسان نیەو کاریگەرییەکی زۆر دەکاتە سەریان.»

رونیشیدەکاتەوە : «ئەو کەسانەی عەرەبیان خوێندوە مەگەر زۆر زیرەک بن بتوانن دەرچن، ئەگەر دەریش نەچن ئەوا کاریگەری نەرێنی دەکاتە سەریان و لەوانەیە توانای خوێندیان نەمێنێ.»

توێژەرە کۆمەڵایەتییە، بەپێویستی زانی کە دەرفەتی فێربونی زمان و راهێنانی ئەو قوتابی و خوێندکارانە زیاتر بکرێن، بۆ ئەوەی لەلایەک لە خوێندن دانەبڕێن و لەلایەکی دیکەشەوە توشی گرێ و گرفتی دەرونی و بێزاریش نەبن.

بەڵام پرسیار ئەوەیە، پەروەردە لەمبارەوە چی بۆ ئەو خوێندکارانە کردوە؟

بەوتەی (م.دارا ئەحمەد)، بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی گەرمیان، ئەوان هاوکاریەکی بەرچاوی ئەو خوێندکارانەیان کردوە کەلە ناوەڕاست و خوارەوەی عێراق هاتونەتەوە.

باسیلەوەکرد کە ئەوان قوتابخانەی تایبەتیان بۆ ئەوانە کردوەتەوە کە خوێندنیان عەرەبییە، بۆ ئەوەی دانەبڕێن، هەروەک هاوکاری ئەوانی دیکەشیان کردوە کەبەکوردی دەخوێنن.

لەبارەی ئەو داوایانەی کە دەکرێن بۆ بەخشینی خوێندکارانەی کەلە ناوەڕاست و خواروی عێراق گەڕاونەتەوە، (م.دارا) ئاماژەی بەوەکرد کە بەخشین ناتوانرێت ئەنجام بدرێت، بەڵام ئاسانکاریی و هاوکاریی بەرچاویان کراوە.

# ئەو ژنانەی بژێوی خێزانەکانیان لە قوڕ پەیدا دەکەن

■ نەوژین، ژینۆ عەلی

**ئەگەرچی داواو خواست لەسەر دروستکردنی تەنوری قوڕ «گڵ» وەکو پێشتر نییە، بەڵام زۆرن ئەو خێزانانەی هەتا ئێستاش نانی ئەم تەنورانە بە نانی ئامادەکراوی بازاڕ و مارکێتەکان ناگۆڕنەوە، لەبەرامبەریشدا زۆرن ئەو ژنانەی کە دروستکردنی تەنوری قوڕ، بوەتە پیشەو سەرچاوەی بژێوییان.**

لەئێستادا ژمارەیەکی بەرچاوی ژنان لە گەرمیان، بەکاری دروستکردنی تەنوری گڵینەوە سەرقاڵن، ئەوان لەو ڕێگەیەوە بژێوی خۆیان و خێزانەکەشیان دابین دەکەن.

فاتمە عەزیز، (٥٥) ساڵ، یەکێکە لەو ژنانەی کەلەناحیەی ڕزگاریی لەبواری دروستکردنی تەنور دا کار دەکات.

ئەو بۆ (نەوژین) وتی: «من هەر لەتەمەنی گەنجێتییەوە خەریکی کاری دروستکردنی تەنوری قوڕین و ئەو داواکارییانە بوم کە خەڵکی دەیان کرد.»

وتیشی: «بژێوی ژیان و سەختی گوزەرانمان وایکردوە ئەوکارە بکەم، چونکە هاوژینەکەم نەخۆشبوەو پێویستمان بەپارەبوە، بۆیە پەنام بردۆتە بەر ئەو کارە».

ئەو باسیلەوەشکرد کە لەماوەی ئەم چەند ساڵەی کارکردنی دا، ئەزمونێکی باشی لە دروستکردنی تەنور دا دەستکەوتوەو لەزۆر شوێنەوە بەمەبەستی کڕینی تەنورەکانی سەردانی دەکەن.

ئەگەرچی لە کۆمەڵگای کوردی دا ژنان کەمتر کار دەکەن، بەڵام هەر لە کۆنەوە هەندێک پیشە هەبون کە زیاتر لە پیاوان، ژنان تیایدا کارامەو شارەزاتر بون، ڕەنگە دیارترینیان دروستکردنی تەنور بێت.

ئەم پیشەیەش بەوە ناسراوە کەلەیەک کاتدا پێویستی بە هێز و تواناو تەرکیز هەیە، چونکە کارامەیی پیشەکە وەک ئەو ژنانە باسیی دەکەن، لەدیاریکردنی جۆری گڵ و شێوازی گرتنەوەی قوڕی تەنورەکەو پاشان بونیاتنانی بناغەی تەنور و دەرکردنی ئەو شکڵ و شێوە گۆزەیی و بازنەیەی کەلەتەنوردا هەیە، دەردەکەوێت، کە ئەمەش کارێکە بەهەمو کەس ناکرێت، تەنانەت پیاوانیش.

تائێستاش بەشێکی زۆری خێزانەکان بەتایبەتی لەلادێ و گەڕەکە هەژارنشینەکان پشت بە تەنوری قوڕ دەبەستن، ئەمەش وادەکات بەردەوام داواکاری لەسەر ئەم بەرهەمە هەبێت، هەربۆیە ژنانێک دروستکردنی تەنوریان وەکو پیشەیەک لێکردوە، کەلەڕێگەیەوە بژێوییان پەیدا دەکەن.

خەدیجە عەلی، (٥٠) ساڵ، بۆ (نەوژین) وتی: «بژێوی ژیانمان لەسەر دروستکردن و فرۆشتنی ئەم تەنورە قوڕانەیە، هەرچەندە ژیانمان سەختەو خۆیشم باری تەندروستیم جێگیر نیە، بەڵام ناچارم ئەم کارە بکەم».

خەدیجە باسی لەوەشکرد هەرچەندە خەڵک زیاتر تەنوری غازی بەکاردەهێن، بەڵام داواکاری لەسەر تەنوری قوڕیش تاڕادەیەک باشە، بەتایبەت لەسەرەتای دروستبونی قەیرانی داراییەوە. وتی: «لەگەڵ دروستبونی قەیران دا داواکاری خەڵکیش لەسەر ئەم تەنورانەی ئێمە زیاتر بوەو لەچاو جاراندا فرۆشی زۆرترە».

ئەو ژنانە ئەگەرچی کارێکی سەخت دەکەن کەلەڕوی جەستەییەوە پێویستی بەتوانایەکی زۆر هەیە، سەرباری ئەوەشی کە زۆر ماندو دەبن بۆ ئەوەی بەرهەمەکانیان بە باشیی دەربچێت، لەگەڵ ئەوەشدا دڵخۆش و شادومانن بەوەی دەتوانن کارێک بکەن کە لەڕێگەیەوە بەسەربەرزانە دەژین.

فاتمە ئاماژەی بەوەکرد، پاش نەخۆشکەوتنی مێردەکەی، توانیویەتی لەڕێگەی ئەم ئیشەوە بژێویی خۆیان دابین بکات و ناچار بە کۆمەکی خەڵکی نەبن.

وتیشی: «ئەگەرچی ئیشەکەمان زۆر نیەو داهاتیشمان هەر زۆر نیە، بەڵام هەر دڵخۆشم کە توانیومە لە ڕێگەی ئەم کارەوە بژێوی ژیانمان پەیدا بکەم و موحتاجی دەستی کەس نەبین».

ئامینە محەمەد، کەیەکێکی ترە لەو ژنانەی کار لەم پیشەیەدا دەکات، ئاماژەی بەوەکرد کە پاش ئەوەی هاوژینەکەی مرد، ئەرکی بەخێوکردنی خێزانەکەی کەوتە ئەستۆی ئەو.

وتیشی: « ئێستا ئەرکی بەخێوکردنی منداڵەکانم لەسەرە، بۆیە ئەم کارە لەهەموکارێک باشترە بۆمن تاوەکو بژێوی بۆ خۆم و منداڵەکانم دابین بکەم».

ژنێک لە کاتی دروستکردنی تەنور دا

فۆتۆ: کەرکوک ناو

---

(هەتیویی، ئاوارەیی و نەخۆشی درێژخایەن) چۆکیان پێدانەداوە

# چیرۆکی ژنە فرۆشیارێکی کەلار



■ نەوژین،
زریان محەمەد — جوانە جەلیل

**دایکی مەروا، هاوشێوەی ئەو ئافرەتانەی ڕچە شکێنییان کردوە بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانیان، شانبەشانی هاوسەرەکەی بۆ ماوەی بیست ساڵە خەریکی کارکردنە، چەندین جۆر کاری ئەنجام داوە لەوانە: تەکاندنی فستق و بژارەکردنی سەوزەو کاری ئارایشگاو دروستکردنی نان بۆ ماڵان و لە ئێستاشدا دوکانی کەمالیاتی هەیە.**

> بەهۆی سەختی ژیانەوە دەست بەرداری خوێندنەکەم بوم

> ماوەی سێ ساڵە فرۆشگام داناوەو ژیانی پێ بەڕێدەکەم

ڕەنگە ئەو ناخۆشی و کارەساتانەی بەسەر دایکی مەروا داهاتبێت، بەرگەگرتنی بۆ زۆربەمان ئاسان نەبێت. ئەو لەیەک کات دا ئاوارەیی و لەدەستدانی ڕۆڵەو کەسوکار و ئازاری نەبونی چەشتوە، بەڵام سەرباری ئەمانەش، وەکو ژنێکی بەتوانا لەسەر پێی خۆی وەستاوەتەوە.

ئەو ڕۆژانە لە دوکانەکەیدا کاردەکات و بە داهاتەکەشی، خێزانەکەی دەژێنێت.

ئەو کە خەڵکی ناوچەی سەعدیەیەو لە دوای ساڵی (١٩٩٧) وە دێتە شاری کەلار و لە یەکێک لە گەڕەکە هەژار نشینەکانی شار دانیشتەجێ دەبێت .

دایکی مەروا، کە ئێستا تەمەنی (٥١) ساڵەو لە تەمەنی یەک ساڵیدا دایک و باوکی لەدەست دەدات، کە باوکی بەهۆی کێشەی کۆمەڵایەتیەوە دەکوژرێت و دایکیشی لە دوای مردنی هاوسەرەکەی توشی سەکتەی دڵ دەبێت و بۆ هەمیشە ماڵئاوای لە سێ جگەر گۆشەکەی دەکات کە دو کوڕو کچێکی تاقانەیە، وەک خۆی دەیڵێت تەنانەت لە وێنەشدا ئەوانی نەبینیوە و شێوەی ڕوخسارییان نازانێت.

ئەو کەفرمێسک لە چاوەکانیدا قەتیس مابون و بەو زمانە کوردییە پچڕپچڕەوە باس لە نەهامەتیەکانی دوای لە دەست دانی دایک و باوکی دەکات، وتی: «دو براکەم لە ژێردەستی مامم بەخێوکران و منیش لەلای خزمێکی دوری باوکم پەروەردەکراوم، لەئیستادا هەردو براکەم هاوسەرگیرییان کردوەو دور لە من ژیانی خۆیان دەگوزەرێنن، منیش لەتەمەنی (١٦) ساڵیدا هاوسەرگیریم ئەنجام دا، کەئەوکات خوێندکاری چوارەمی ئامادەی بوم، بەڵام بەهۆی سەختی ژیان و ماڵ و منداڵەوە دەست بەرداری خوێندنەکەم بوم.»

دایکی مەروا، کە ئاسەواری خەمێکی قوڵ نێوچاوانی تەنیبو، جاروبار بۆ شاردنەوەی فرمێسکەکانی خۆی بە ڕێکخستنی شتومەکی ناو دوکانەکەیەوە سەرقاڵ دەکردو درێژەی بە قسەکانی دا: «نالەباری ژیان و گوزەرانمان ناچاری جێهێشتنی زێدی خۆمانی کردین و ڕومان لەشاری کەلار کرد.»

وتیشی: «خاوەنی شەش منداڵ بوم، سێ کوڕ و سێ کچ ، بەڵام کچە گەورەکەم بە دوگیانی و بە هۆی نەخۆشی خوێنەوە گیانی لەدەستدا و کچێکی تەمەن (١٠) ساڵی لەدوای خۆی بەجێهێشت، ئەو کچەش دوای ماوەیەک بەهۆی تەقینەوەیەکەوە لە سەعدییە گیانی لەدەست دا».

دایکی مەروا، دوان لە منداڵەکانی ژیانی هاوبەشیان پێک هێناوە، بەڵام هاوسەری کوڕەکەی (بوکەکەی) بەهۆی تەقینەوەی تەباخی غازەوە گیان لەدەست دەدات و (٢) جگەر گۆشەی لە دوای خۆی بەجێدێڵێت.

وتیشی: «بەهۆی ئەوەی کە خۆم بە هەتیویی و دور لەنازی دایک و باوک گەورە بوم، ئێستا ئەو دو منداڵەم هێناوەتەوە لای خۆم و هاوشێوەی منداڵەکانی خۆم سۆز و خۆشەویستیم پێداون، چونکە ژیانی منداڵی و ڕابردوی خۆم لەواندا دەبینمەوە».

دایکی مەروا، باسی لەوەشکرد: لەئێستادا باری ئابوریمان باشترەو لەو دوکانەی کە بۆ ماوەی (٣) ساڵە کاری تێدا دەکەم، بەو داهاتەی دەستم دەکەوێت بەشێکی دەکەم بە خەرجی ئەو دو منداڵەی کەلە دوای مردنی بوکەکەم بەجێماون و خۆم بەخێویان دەکەم، بەشەکەی دیکەشی دەدەم بە کڕینی حەپ و دەرمان بۆ نەخۆشی دڵ و شەکرە و زەخت کەبەهۆی خەمەوە دوچاری هاتوم.

وتیشی: «لەگەڵ ئەوەشدا دەستی هاوکاری بۆ چەندین منداڵ و خێزانی کەم دەرامەت درێژدەکەم چ لەڕێگەی ماددییەوە بێت یاخود بەدابین کردنی پێداویستیەکانیان لە دوکانەکەم هاوکارییان دەکەم».

# سەلە کەلاری...

▪ نەوژین، شۆخان حەمەساڵەح

**ئەی سەلە سەلە چەنێ سەلاری**
**دەڵێی ئاسکەکەی دەشتی کەلاری**

**ئەی سەلە سەلە عەمرەکەم سەلە**
**دەڵێی ئاسکەکەی دەشتی شاکەلە**

(سەلمە)، ناوێکە ئاشنا بەگوێی نەوەی نوێ و رابردو لە نێو ئەم شارو مەملەکەتی ماریفەتەی گەرمیان. ئەو ژنێکە بەوێنەی شێرێک لە مێژوی سەردەم و دەورەی خۆیدا بەدەم رۆژی تەمەنەوە خۆی نویسیوەتەوەو لە ئاراستەکانی ژیاندا ئەسپی خۆی تاوداوە. لەمێژویەکدا کە زۆرینەی ناوە دیارەکانی پیاون، ئەم وەکو ژنێکی دیار و سەلار، جێی گرتوە.

بۆ گەرمیانیەکان، گۆرانی (سەلە کەلاری) کە هەندێک بە (سەلمە کەلاری)یش گۆیان کردوە، گۆرانیەکی بیستراوەو دڵخوازە، بەڵام رەنگە زۆربەمان نەزانین کە ئەم ناوە، لەو ناوانە نیە کە شاعیران و هونەرمەندان لە خەیاڵی خۆیانەوە دروستیان کردوە، بەڵکو سەلە، ژنێکی ناسراوی گەرمیان و بەدیارییکراوی کەلار بوە.

بۆ ناساندنی چیرۆکی ژیانی ئەم خانمەی کوردە و دەرخستنی وردەکاریەکانی، (نەوژین) لەسەر زاری (عەدنان محەمەد قارەمان)ی کوڕیەوە، کورتەیەک لە ژیانی دەخاتەڕو.

سەلەکەلاری، ناوی تەواوەتی (سەلمە عەبدولکەریم محەمەدنوری)یە، لە هۆزی جافە، باوکی لەتیرەی باشکی و دایکی لەتیرەی ئێسوجانیە. ساڵی ١٩٣٧ لە دێی کەلار (گەڕەکی کەلاری کۆنی ئیستا) لەدایکبوە، تاقانەی دایک و باوکی بوە خوشک و برای نەبوە.



ئەم خانمە، خاوەنی باڵایەکی بەرزو روخسارێکی جوان و دیمەنێکی شۆخ و شەنگ بوە. پۆشاکی هەمیشەیی جلی کوردی رەسەنی هۆزەکەی پۆشیوە کە لەچک وکراس و کەواو کڵاو مێزە و لوتەوانە بەشێوەیەکی لێزانانە بەستونی و بەکاری هێناون کە بوەتە هۆی سەرنجراکێشانی خەڵکی بەگشتی، تەنانەت ژنان داوایان کردوە ئەو شێوازەیان لەخۆگۆڕین فێربکات. هەروەها بۆن و بەرامەی ئەو کاتی بۆ بۆنخۆشی کە مێخەک بوە، بەکارهێناوە. هەروەک بەپێی گێڕانەوەکان یەکەم کچی کەلار بوە ئارایشت (میکیاج)ی بەکارهێنابێت.

لەروی شێوازی قسەوگفتوگۆوە، ئافرەتێکی لەسەر خۆو بزە لەسەر لێو بوە، درۆ و دوزمانی وماستاوچێتی لا حەرام بوە، لەپەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا پەیوەندیەکی فراوانی هەبوە، حەزی لەمیوان کردوە و بەرویەکی خۆشەوە پێشوازی لێکردون و بەڕێی کردون.

ئەم خانمە خزم دۆست و خۆشەویستی دراوسێکانی بوە، هەروەها پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ بەگزادەکاندا هەبوە، خۆشەویستی و رێزی لای (فەتاح بەگ و حسێن بەگ)ی جاف هەبوەو خوشک و برای شیریشن.

ئەم خانمە، چالاک و ئازابوەو لەنیشتمان پەروەریشدا جێدەستی دیاربوە بەتایبەت لەخزمەتکردنی پێشمەرگە، بەشێوەیەک لەساڵی ١٩٦٤ تا بەیاننامەی یازدەی ئازاری ١٩٧٠ ، ماڵی وەک لانکەو پەناگەی ئارامی تێکۆشەران بوە. لە ساڵی ١٩٦٧ میوانداری لە (جەلال تاڵەبانی) کردوە کە ئەوکات سەرکردایەتی باڵێکی نێو پارتی دیموکراتی کوردستانی دەکرد، ئەویش رێزی لێناوە.

سەلمە کەلاریی، لەساڵی ١٩٥٣ هاوسەرگیری لەگەڵ (محەمەد قارەمانی زەنگەنەدا) کردوە کە خاوەنی سێ کوڕ و شەش کچە. وەک کوڕەکەی دەیگێڕێتەوە، پێش کۆچی دوایی، وەسێتی بۆکردون و پێی وتون: «خاکتان نەفرۆشن بۆ سەرتان، سەرتان بفرۆشن بۆخاکتان».

ناوبانگی قەشەنگی و جوانی ئەم ئافرەتە بەشێوەیەک بوە کە لە هونەری کوردیشدا رەنگی داوەتەوە، دیارترینیشیان ئەو گۆرانیە بو کە (حەمەحسێن کێمنەیی) وتویەتی.

گۆرانیەکەی حەمەحسێن، لەوەڵامی بەیتە شیعرێکی (داود بەگ) دا بوە، کە (داود بەگ) بەیتە شیعرەکەی بۆ کچێکی دیکە وتوە کە هەر ناوی (سەلمە) بوە، (حەمەحسێن)یش بۆ (سەلە کەلاری) وتوە.

داود بەگ، دەڵێت:

«سەلە هۆ سەلە تۆ چەند بەنازی ...
دەڵێی ئاسکەکەی دەشتی پێبازی»

لەوەڵامدا، حەمە حسێن کێمنەیی، دەڵێت:

«سەلەهۆ سەلە تۆچەن سەلاری ...
دەڵێی ئاسکەکەی دەشتی کەلاری ...
سەلەهۆ سەلە تۆ چەن کەڵ ملی...
دەڵێی ئاسکەکەی دەشتی شاکەلی»

ئەم گۆرانیە تائێستاش لەنێو هونەری کوردیدا بە زیندویی ماوەتەوەو هەرجارەو لەلایەن هونەرمەندێکەوە نوێدەکرێتەوە.

دواین هونەرمەند کە ئەم گۆرانیەی وتوەتەوە، (عوسمان میروەیس)ە، کە هێندەی تر ناسراویی و برەوی داوە بەم گۆرانیە.

هونەرمەند (عوسمان میروەیس)، لەبارەی ئەم گۆرانیەوە، بۆ (نەوژین) وتی: « گۆرانی (سەلمە) وەکو یەکێک لە سیما دیارەکانی گۆرانی ناوچەی گەرمیان و کەلار بەتایبەتی دەرکەوتوەو ناوی پەیدا کردوە، بۆیە منیش ویستم جارێکی دیکە ئەم ئاوازە رەسەنە بە گوێی نەوەی نوێ و هەروەها وەبیر نەوەی کۆنیش بێنمەوە، بۆیە لەگەڵ ئازیزانی گروپی موزیکی لوڕ هەستاین بە تۆمارکردنی.»

وتیشی: خۆشحاڵم کە دەبینم گۆرانیەکە کاردانەوەو دەنگدانەوەی باش و ئیجابی لەناو هاوڵاتیان دا لێکەوتۆتەوەو جارێکی دیکە ئاوازەکە کەوتوەتە سەر زار.

ئەم ئافرەتە گەرمیانیە، لەبەرواری ٢٠٠٧/١/٢٤ ماڵئاوایی هەمیشەیی لە ژیان و نیشتمانەکەی کردوە.

# شادبونەوەی دایکێک بە کۆرپەکەی پاش دوساڵ و نیو

▪ نەوژین،
زریان محەمەد- جوانە جەلیل

**دایکی توند منداڵەکەی لە ئامێز گرتبو، ناو بەناو ماچێکی دەکرد و دەستی بەسەریدا دەهێنا، وەکو ئەوەی هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەی نەکردبێت کە دوای لەیەکتر دابڕانیان جارێکی تر بیبینێتەوە.**

کاتێک زینە تەمەنی حەوت مانگ بو، شەڕی داعش (مونیفە زەحوی) دایکی لێ دابڕی و کاتێک یەکتریان بینیەوە، زینە تەمەنی گەیشتبوە سێ ساڵ، بۆیە دایکی نەدەناسیەوە.

لەماوەی دو ساڵی رابردودا مونیفە زەحوی و هاوسەرەکەی لە گۆڕەپانی شەڕی نێوان داعش و سوپای عێراق لەموسڵ گیریان خواردبو، بەڵام زینەی کچی لەگەڵ خوشک و براکانی تریدا خۆیان گەیاندبوە ناوچە ئارامەکان و دواجار لە کامپی تازەدێی گەرمیان گیرسانەوە.

لەماوەی ئەو دو ساڵەدا کە مونیفە و هاوسەرەکەی لەموسڵ و منداڵەکانیان لە کوردستان بون هەمو جۆرە پەیوەندیەک لەنێوانیاندا پچڕا بوە، تا دواجار هەفتەی رابردو مونیفە شوێنی منداڵەکانی زانیوە و لەکامپی تازەدێ بەیەکتری شاد بونەتەوە.

شاد بونەوەی منداڵەکان بە مونیفەی دایکیان جیاوازتر بو، لە شاد بونەوەی زینە پێی، بەو پێیەی زینە پێشتر مونیفەی دایکی نەبینیوە و هودا رەمەزانی خوشکی بەدایکی زانیوە.

مونیفە زەحوی لەکامپی تازەدێ زینەی کچی لە ئامێز گرتبو، بۆ نەوژین دوا و وتی: «تا ئێستاش زینە نازانێت ئەو دایکیەتی، چونکە کاتێک ساوا بوە شەڕ لێی دابڕیوە.»







مونیفە زەحوی، رونیکردەوە لەماوەی دو ساڵی رابردودا کاتێک لەموسڵ و دور لە منداڵەکانی ژیانی گوزەراندوە، هەمو جۆرە ناخۆشیەکی بینیوە و هەمیشە دڵی لایانبوە، چونکە نەیزانیوە کە چیان بەسەر هاتوەو شەڕ لەیەکتری دابڕیبون.

مونیفە، وتی: «کاتێک شەڕ گەرم بو، لەمنداڵەکانم دابڕام، زینەش لای خوشکە گەورەکەی بو، رۆیشتبون بەرەو هەرێم و لەتەمەنی ٧ مانگیەوە ئەو بەخێوی کرد.»

هەفتەی رابردو دوای زیاتر لە دو ساڵ، مونیفە توانی خۆی لەگۆرەپانی شەڕ دور بخاتەوە و خۆی بگەیەنێتە کامپی تازەدێ و بە منداڵەکانی شاد بێتەوە، کە لەگەڵ گەیشتنیدا یەکەم کاری لەئامێز گرتنی زینە بو.

مونیفە وتی: «ئێستاش زینە وا دەزانێت خوشکەکەی دایکیەتی نەک من.»

هودا رەمەزان، خوشکی زینە، تەمەنی نزیکەی ٣٠ ساڵە و ژیانی هاوسەری پێکەوە ناوە و کوڕێکی هاوتەمەنی زینەی هەیە، لەماوەی دو ساڵی رابردودا زینە و کوڕەکەی پێکەوە بەخێو کردوە.

هودا باسیلەوەکرد بەشێوەیەک زینەی بەخێو کردوە کە هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ منداڵەکەی خۆیدا لەنێوان نەکردوە، وتی: «زینە ئەوەندە گوێی لێبو کوڕەکەم بەدایە بانگی دەکردم، بۆیە ئەویش لەوەوە فێر بو، هەر بە دایە بانگم دەکات.»

بەپێی وتەی هودا، پێش گەیشتنی دایکی بۆ لایان بەتەلەفۆن قسەیان لەگەڵ کردوە ، لەو کاتەدا بەزینەی وتوە: «کەئەو خوشکی گەورەیەتی نەک دایکی، ئیشەڵا دایکی دێت بۆ لای.»

هودا درێژەی بەقسەکانی دا، ئاماژەی بەوەکرد «زیاتر لەهەفتەیەکدا دایکی لەگەڵیاندایە، سەرەتا زینە نەدەچوە لای و لێی نزیک نەدەبویەوە، چونکە نەیدەناسیەوەو نەیدەزانی دایکێتی، بەڵکو پێی وابو کە من دایکی ئەوم».

وتیشی: «بەو هۆیەی هەر لەگەڵ کوڕە بچوکەکەم گەورەم کردون و وەک ئەو نازم پێداوە، بۆیە هەستی بە بێکەسیی نەکردوە و واینەزانیوە کە دایکی لەلای نیە».

وەکو ئەو دەڵێت: «ئێستا زینە تاڕادەیەک بە دایکی خۆی راهاتوەو وردە وردە هۆگری بوەو لەگەڵی دەبێت، بەڵکو ئەگەر دایکم بڕوات بۆ شوێنێک یان سەردانی دراوسێیەک بکات ئەو بەدوایدا دەگری و داوای دەکات».

هودا ئاماژەی بەوەشکرد کە لەسەرەتای هاتنەوەی دایکیەوە زینە نەک لەلای نەدەخەوت، بەڵکو کەمیش دەچوە لای و نەیدەناسی و هەستی بۆی نەبو، بەڵام ئێستا باشتر بوەو لەگەڵ دایکم دەخەوێت، خەریکە رادێت لەگەڵی.»

# بۆچی ئامادەیی ژنانی گەرمیان لە راگەیاندن دا لاوازە؟



کچە بێژەرێک لە رادیۆی دەنگ

■ نەوژین، شۆخان حەمەساڵەح

**هەرکاتێک ژمارەی رۆژنامەنوسان لەگەرمیان رو لەزیاد بون دەکات، ئەم زیادکردنە لە روی رەگەزییەوە لاسەنگ دەبێت، چونکە زۆرینەی زۆری رۆژنامەنوسەکان لەرەگەزی نێرن و کەمترینیان لە رەگەزی مێ.**

لەچەند ساڵی رابردودا، چ لە روی ژمارەو چ لە روی جۆرێتییەوە، بەرەوپێشەوەچونێک لە بواری راگەیاندن دا گەرمیان هاتوەتە بون، بەڵام ئەوەی مایەی تێبینییە کە کەمتر ژنان بەشدارن لەم بەرەوپێشەوەچونەو تارادەیەکی زۆر خۆیان لە کایەکە دورە پەرێز گرتوە.

هۆکاری چیە کەمتر ژنان و کچان دەبنە رۆژنامەنوس؟ ئایا رێگرییە یاخود نەرەخساندنی دەرفەت؟ ژنان خۆیان کەمتەرخەمن یان ناچار بە گۆشەگیریی دەکرێن؟

بێریڤان ئەحمەد، یەکێکە لەو کچانەی کە هەوڵدەدەین وەڵامی بەشێک لەم پرسیارانەمان لێوە دەستبکەوێت.

ئەو کە خوێندکاری زانکۆیە، لەباسکردنی هۆکارەکانی دورەپەرێزی کچان و ژنانی گەرمیان لە بواری راگەیاندن، خێزان و کۆمەڵگەی بەهۆکار زانی. وتی: «کچانی ئەم ناوچەیە خولیای بوارەکەن، بەڵام بەهۆی لاوازی ئاستی رۆشنبیری و تێڕوانینی کۆمەڵگە کە بە چاوێکی نزمەوە لە کچانی راگەیاندکار دەڕوانن، وایکردوە ئەو خولیایەیان بمرێنن لەناخیان دا».

چنور مەجید، کە کچە دەرچویەکی زانکۆیە، هەمان رای بێریڤانی هەیە. ئەو باس لەوەدەکات کە زۆرجار خێزانەکان دەرفەت بە کچانیان دەدەن، بەڵام بەهۆی توانج و رێگری کۆمەڵگەوە، کچان ناتوانن بەردەوام بن لەکارکردن.

ئەو وتی: «کۆمەڵگە بەپلەی یەکەم هۆکارە، چونکە ئەگەر خێزانەکانیش رێگە بدەن بەکچەکانیان کە لەو بوارە کار بکەن، بەڵام قسەی کۆمەڵگە ساردیان دەکاتەوە».

لە گەرمیاندا چەند دەزگایەکی راگەیاندن هەبون وهەن کە زۆربەیان سەر بەلایەنە سیاسییەکانن، ئەمانە بەشی زۆری کادیرەکانیان لە رەگەزی نێرن. لە رابردوش دا چەند هەوڵێکی میدیایی ژنان هەبون، وەکو بونی رادیۆیەکی تایبەت بە ژنان بەناوی رادیۆی (تەوار)، یاخود بونی رۆژنامەی (پاریا) کە ئەویش تایبەتمەند بو بە ژنان، بەڵام لەئێستادا هیچکام لەو دەزگایانە بونیان نەماوەو داخراون.

بەوتەی ئازاد عوسمان، بەڕێوەبەری رادیۆی دەنگ لەکەلار، کە رادیۆیەکی کۆمەڵگەیی ئازادە، پرسی ئامادەیی ژن لە راگەیاندن دا، دولایەنەیە.

ئەو رونیکردەوە «لە لایەک پەیوەندی بەکۆی تێڕوانینی کۆمەڵگە بۆ ژنان و تێڕوانینی خودی ژنان بۆ خۆیانەوە هەیە، لەلایەکی دیکەشەوە پەیوەندی هەیە بە رەخساندنی دەرفەت و هەل بۆ ژنان».



باسیلەوەشکرد کە بەپێی ئەزمونی خۆیان، ئەگەر ژنان دەستگرۆیی و هاوکاریی بکرێن، ئەوا زۆر بەباشیی لە بوارەکەدا دەچنە پێشەوە «لەم روەشەوە نمونەی سەرکەوتو و باشمان هەیە».

وتیشی: «ئەگەرچی ژمارەیان زۆر نیە بەڵام رۆژنامەنوسی چالاک و بەتوانای ژن لە گەرمیاندا پێگەیشتون».

زۆرجار کەباس لە ناچالاکیی ژنان لە کایە جیاوازەکاندا دەکرێت، رایەک سەرهەڵدەدات کە خودی ژنان بەهۆکار و بەرپرس دەزانێت لەو ناچالاکییە.

بێریڤان ئەحمەد، هاوڕایە لەگەڵ ئەم بۆچونەو پێیوایە «هەندێکجاریش ژنان خۆیان خەمسارد بون لە کارکردن لەو بوارەدا.»

ئەم بۆچونەی کچە خوێندکارەکە لەبارەی خەمساردی خودی ژنانی گەرمیان بۆ کارکردن لە کایەی راگەیاندن، لەلایەن توێژەرێکی کۆمەڵایەتییەوە، خوێندنەوەی دیکەی بۆ دەکرێت.

دڵشاد ستار، بۆ (نەوژین) وتی: «کاری راگەیاندن بەکارێکی قورس دادەنرێت لە کوردستان وگەرمیان بەتایبەتی، ئەمەش هۆکارە بۆ ئەوەی ژنان زات نەکەن وەکو پیشە هەڵیبژێرن».

نوسەرو چاودێر (شیلان محەمەد)، تارادەیەک کۆکە لەگەڵ ئەم بۆچونەو پێیوایە «سروشتی کاری راگەیاندن کەپێویستی بەکاتی زۆر و بەدواچونی بەردەوام و ئاستی زانستی پرۆڤیشناڵی هەیەو وادەکات هەمو کەسێک دەست بۆ ئەوکارە نەبات».

ئەوەشی وت: «کۆبونەوەی دەزگاکانی راگەیاندن لەپارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی وادەکات ئەوانەشی لەناوچەکانی دیکەوە بیانەوێت لەم دەزگایانە وەک ستاف کار بکەن، ناچار شوێنی نیشتەجێبونیان بگوازنەوە بۆ ئەو پارێزگایانە، کەئەمەش ئەرکێکی قورسە بەتایبەت بۆ ئافرەت».

لەوەڵامی پرسیاری ئەوەی تاچەند دەزگاکانی راگەیاندن لەناوچەکە ئەرکیان لەئەستۆیە؟ شیلان محەمەد وتی: «دەزگاکانی راگەیاندن لەناوچەکەناتوانن هەمو ئەرکەکان بگرنە ئەستۆ، چونکە دەرامەت و توانایان دیاری کراوە، بەڵام دەتوانن لەرێگەی رەخساندنی هەلەوە بەشێوازی وەرگرتن و راهێنان و کردنەوەی خول بۆ ئارەزومەندانی بوارەکە، پرۆژەیان هەبێ و بۆ خودی دەزگاکەش ببێتە سەرچاوەی داهات.»

> کاری راگەیاندن بەکارێکی قورس دادەنرێت لە کوردستان

> ژنان هاوکاریی بکرێن، زۆر بەباشیی لە راگەیاندن دا دەچنە پێشەوە

# 10 گرنگترین ئەو کتێبانەی ژنان نوسیویانە









■ نەوژین

**لەچەند دەیەی رابردودا، ئاستی ئەفراندن و نوسینی ژنان لە جیهان بەرادەیەکی بەرچاو بەرەوپێشەوەچونی بەخۆیەوە بینیوە، ئەمەش وایکردوە رێژەی بەرهەمی نوسەرانی ژن لە جیهاندا بەگشتی، زیاد بکەن و رێژەی داواو خواستیش لەسەر بەرهەمەکانیان، بەهەمانشێوە رو لە زیادبون بکات.**

لەخوارەوە، لیستێک بەناوی ١٠ لە باشترین ئەو کتێبانە دەخەینە رو کەلە ساڵی ٢٠١٥ دا بڵاوبونەتەوەو نوسەرەکانیان ژنن.

١. (یەر ئۆف یاس):
لەنوسینی (شۆندا ریمس). شۆندا بەتەنیا ژنێکی بەهێز و کاریگەر نییە لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە، بەڵکو نوسەرێکی باشە. بەوتەی خوێنەرانی، ئەم کتێبەی زۆر گرنگ و چێژبەخشە.

٢. (نیگرۆلاند):
لەنوسینی (مارگۆ جیفەرسۆن). ئەم کتێبە گێڕانەوەیەکی واقیعیی چیرۆکی رەگەزپەرستی و جێندەر و شکستهێنانە، وەکو یەکێک لە کتێبە گرنگ و خاوەن بەها مرۆییەکانی جیهان، دەستنیشان کراوە.

٣. (ئیم ترین):
لەنوسینی (پاتی سمیس). بەوتەی نوسەران، ئەم کتێبەی سمیس، کتێبێکی گرنگ و بەپێزەو درێژکراوەی ئەو زنجیرە کتێبانەیە کە پێشوتر نوسیویەتی.

٤. (گۆڵد فیم سایترس):
لەنوسینی (کلیر واتکنز). ژنە نوسەر (کیزیا ویر)، لەبارەی ئەم کتێبەوە دەڵێت: «هەرکاتێک سەرپشکم دەکەن بۆ هەڵبژاردنی کتێبێک بۆ خوێندنەوە، ئەوا من ئەم کتێبە هەڵدەبژێرم، ئەویش بەهۆی ئەو پێکهاتەو جوانیی و پرسیارە وروژێنەرانەی کەلەخۆی گرتوە».

٥. (مانیوال فۆر کلیننگ ومەن):
لەنوسینی (لوشیا بەرلین). ژنە نوسەر (لیزا شیا)، لەبارەی ئەم کتێبەوە دەڵێت: «بیرت دەخاتەوە کەلەژیاندا هەرچەند بچوک بیت، بەڵام هەمیشە بوارێک هەیە بۆ خەیاڵ و تاقیکردنەوەی تواناکانت».

٦. (هۆڵد ستل):
لەنوسینی (سالی مان). ژنە نوسەر (لیزا چیس) لەبارەی ئەم کتێبەوە دەڵێت: «نوسەر توانایەکی زۆرباشی هەیە لە نوسین دا، هەروەک توانایەکی باشیشی هەیە لە زیندوراگرتنی ساتەکان و بەنەمریی هێشتنەوەیان».

٧. (بیتوین می ئەند یو):
لەنوسینی (ماری نویس). ئەم کتێبە نمونەیەکی بێوێنەیە بۆ ئەو کەسانەی عاشقی زمان و کێشەو ئاستەنگەکانی زمان و رێزمانی ئینگلیزیین.

٨. (لێتس بی لیس ستوپیتد):
لەنوسینی (پاتریشیا مارکس). رەنگە بەیەکێک لە دیارترین ئەو کتێبانە هەژمار بکرێت کە زۆرترین گاڵتەوگەپ و چێژ و خۆشیی لەخۆ دەگرێت، کتێبەکەش نوسینەوەی یادەوەری نوسەر و ئەزمونە فیکرییەکانیەتی.

٩. (ئین زا کانتری):
لەنوسینی: (مایا ئەلڤەر). ئەم کتێبە باس لە کەسانێک دەکات لە فلیپین کەدەستیان لە ژیانی خۆیان هەڵگرتوەو ژیانی دیکەیان هەڵبژاردوە، کتێبەکەش بەشێوازی کورتە چیرۆک نوسراوە.

١٠. (زە ستۆری ئۆف زا لۆست چایەڵد):
لەنوسینی (ئەلینا فیرانتی). لەم تێبەدا نوسەر لە بارەی ژیانی ژنانەوە قسەدەکات بە شیرین و تاڵ و ئەزمون و سەرکێشەکانیەوە.

سەرچاوە:
http://www.layalina.com

# تەمەنی ١٠ ساڵەو جگەرە دەکێشێت!

## جگەرەکێشان لەناو منالانی گەرمیان خەریکە دەبێتە دیاردە

■ نەوژین، پەیام لەتیف

**ئەگەرچی تەمەنی تەنها ١٣ ساڵە، کەچی وەکو جگەرەکێشێکی بەتەمەن دەردەکەوت کاتێک مژی لە جگەرەکەی دەدا. ئەو ماوەی ساڵێکە دەستی بەکێشانی جگەرە کردوە، وەکخۆی دەیڵێت بەدزی کەسوکار و خێزانەکەیەوە جگەرەدەکێشێت، هۆکاری جگەرەکێشانەکەشی بۆ بونی «خەم» دەگێڕێتەوە!**

> زۆربەی هاوڕێکانم جگەرە دەکێشن بۆیە منیش دەیکێشم

جگەرەکێشان ئەگەرچی دیاردەیەکی باو و لەمێژینەی ناو کۆمەڵە، بەزۆری کەسانێک ئەنجامی دەدەن کەخاوەنی تەمەنن، بەڵام ئەوەی لەگەرمیان روی لە زیادبون و پەرەسەندن کردوە، کێشانی جگەرەیە لەلایەن منالانەوە.

ئەگەرچی ئامارێکی رون و ورد لەبارەی ژمارەی جگەرەکێشان بەگشتی و منالانی جگەرەکێش بەتایبەتی بونی نییە، بەڵام بەپێی بەدواداچونێکی (نەوژین)، لە دەڤەرەکەدا حاڵەتی کێشانی جگەرە لەناو منالان روی لەزیاد بون کردوە.

عەلی، ئەو منالەی لەدەستپێکی ئەم راپۆرتەدا ئاماژەی پێکرا، لە پۆلی ٨ی نەرەتیە. لەبارەی هۆکاری جگەرەکێشانییەوە دەڵێت: «بێتاقەتم بۆیە جگەرە دەکێشم!».

باس لەوەشدەکات کە ئەم کارە بەدزیی خێزانەکەیانەوە ئەنجام دەدات «لەهەمو شوێنێک جگەرە دەکێشم جگە لەماڵەوە نەبێت، لەدەرەوەش باوکم دوجار بینیمی کە جگەرە دەکێشم هەڕەشەی لێکردوم و بڕیاری داوە ئەم جارە سزای توندم بدات، بەڵام دایکم ئاگادارنیە.»

زۆرێک لەحاڵەتەکانی جگەرەکێشان، پەیوەندی بە لاساییکردن و چاولێکەرییەوە هەیە، بەشێوەیەک زۆر رۆشتنە دەرەوەی منال وبونی هاوڕێی جگەرەکێش، وادەکات کە منالە هاوتەمەنەکانی دیکەیان لاساییان بکەنەوە.

محەمەد، ١٢ساڵ، کە قوتابی پۆلی شەشی بنەڕەتیە، بۆ (نەوژین) وتی: «زۆربەی هاوڕێکانم جگەرە دەکێشن بۆیە منیش دەیکێشم».

ئەو منالە باس لەو «فێڵ و هونەرانە» دەکات کە بۆ شاردنەوەی جگەرەکێشانیان ئەنجامی دەدەن «لەدوای کێشانی جگەرە، بنێشت دەجوم بۆئەوی بۆنی دەمم نەیەت وماڵەوە نەزانن کە جگەرە دەکێشم، چونکە ئەگەر بزانن لێم دەدەن.»

هەستکردن بەپەراوێزخستن لای منال لەلایەن دایک وباوکەوە، دەبێتە هۆی کێشانی جگەرە لەلایەن منالەوە.

رهێڵ، کە تەمەنی تەنها ١٠ ساڵە، ماوەی ساڵێکە باوکی چوەتە دەرەوەی وڵات، دەڵێت: «لەخەفەتی رۆیشتنی باوکم بۆ دەرەوە وجێهێشتنی ئێمە، ماوەی سێ مانگە بەبێ ئاگاداری دایکم جگەرە دەکێشم.»

کاتێک پرسیاری ئەوەمان لەمنالەکان کرد جگەرە لەکوێ دەکڕن وچۆن دەیکڕن؟

عەلی وتی: «لەدوکان کاتێک دەڕۆم بۆکڕینی جگەرە دەڵێم بۆ باوکمە چونکە ئەگەر بڵێم بۆ خۆمە ئەوا پێم نافرۆشن».

هەندێک لە دوکاندارەکانیش باس لەوەدەکەن کە ئەگەرچی هیچ یاساو رێنماییەکیان بۆ دیارییکراوە بۆ ئەوەی جگەرە بە منال نەفرۆشن، بەڵام ئەوان خۆیان تاک لایەنە و لەلای خۆیانەوە بڕیاریان داوە جگەرە نەدەن بە منالان.

ئاشتی محەمەد، خاوەنی فرۆشگایە لە قەزای کەلار، بۆ (نەوژین) وتی: «من جگەرە دەفرۆشم، بەڵام بەهیچ جۆرێک بەمنالی نافرۆشم، هیچ رێنماییەکیشم بۆ نەهاتوە کە نابێت جگەرە بە منال بفرۆشم».

زۆربەی ئەو منالانەی جگەرە دەکێشن لەقوتابخانەدان، بەمەش ئەرکی مامۆستاکانی قوتابخانەو بەتایبەتی توێژەران بەرامبەر بەم دیاردەیە قورس دەبێت.

محەمەد نەجیب، توێژەری کۆمەڵایەتی، لەوبارەوە بۆ (نەوژین) وتی: «لەئێستادا جگەرەکێشان خەریکە وەکو دیاردەیەکی مەترسیدار لەناوەندەکانی پەروەردەو خوێندن دەبینرێت، بێگومان زیان وخراپی جگەرە زۆر رون وئاشکرایە، توێژەران دەتوانن رۆلی سەرەکی ببینن لەهۆشیارکردنەوەی قوتابیان لەو زیانانە لەرێگای ئەنجامدانی سیمینار بۆ قوتابیان وخێزانەکانیان».

ئەگەرچی دایک وباوک بە پەروەردەکاری یەکەمی منالەکانیان دادەنرێن، بەڵام زۆرێکیان بێئاگان لەوەی منالەکانیان جگەرە دەکێشن.

دایکی منالێک، کەنەیویست ناوی بهێنرێت، ئەوەی بە (نەوژین) وت: «ئەگەر منالەکەم جگەرە بکێشێت لەکوێ ئاگاداربم کە ئەو زۆربەی کات لە دەرەوەیە؟»

بەڵام (محەمەد نەجیب)، توێژەری کۆمەڵایەتی، باسلەوەدەکات زۆرجار خودی خێزانەکان هۆکارن بۆ فێربونی منالان بۆ جگەرەکێشان.

ناوبراو وتی: «زۆرجار خودی خێزانەکان هۆکاری سەرەکی توشبونی منالە بە جگەرەکێشان، چونکە دەبینین باوک یان براگەورە بەبەرچاوی منالەوە جگەرە دەکێشن، بۆیە کە منال ئەمە دەبینێت دەبێتە یارمەتیدەر بۆفێربونی ئەم دیاردەیە و لاسایی لەخۆی گەورەتر دەکاتەوە».

---

# 5 زانیاری سەرسوڕهێنەر لەبارەی کۆرپەلەوە

■ نەوژین

**کۆرپەلەی ساوا لە ماوەی دوگیانی دایکدا کۆمەڵێک شت ئەزانێت کە زۆر سەرسوڕهێنەرن.**

یەکەم: لە تەمەنی چوار مانگی لە سکی دایکدا منداڵ دەنگی دایکی ئەناسێتەوە واتا کە دایکی هەر قسەیەک بکات کۆرپەکە دەزانێت دایکێتی. لە تەمەنی شەش مانگیدا دەنگی ئەندامەکانی تری خێزان دەناسێتەوە وەکو دەنگی باوک و براو خوشکەکانی. تەنانەت ئەگەر میوانێکیان هەبێت و قسە بکات دەزانێت ئەو دەنگە ئەندامی خێزانەکەی خۆیان نییەو کەسێکی دەرەوەی ماڵەکەی خۆیەتی.

دوەم: کۆرپەلە لە تەمەنی حەوت مانگی سکی دایکیدا توانای جیاکردنەوەی زمانی قسەکردنی هەیە. بۆ نمونە ئەگەر دایکەکە بە دو زمانی جیاواز لەگەڵ کەسانی تر قسە بکات منداڵەکە درک بەوە ئەکات ئەو دو زمانە جیاوازن تەنانەت لە یادەوەریدا شێوازی قسەکردن لە مێشکیدا ئەمێنێتەوە بۆیە دوای لەدایک بون و لە تەمەنی دەست کردن بە قسە کردن سودی لەو یادەوەرییەی پێشو ئەبینێت کە لە سکی دایکیدا فێری بوە.



سێیەم: کۆرپەلە لە دوای تەمەنی حەوت مانگی لە سکی دایکیدا هەست بە رۆشنایی ئەکات واتا ئەگەر رۆشناییەک یان لایتێک روەو دەم و چاوی کۆرپەلە بکرێت، دەست دەکات بە جوڵەو رو وەردەچەرخێنێ.

چوارەم: کۆرپەلە لەدوای تەمەنی دو مانگ و نیو لە سکی دایکیدا توانای جیاکردنەوەی تامی شیرین و تاڵ و ترشی هەیە. ئەگەر دایکەکە لە ماوەی دو گیانیدا تام و خۆراکی جۆراو جۆر بخوات وا ئەکات منالەکە دوای لەدایکبون پێی ئاسایی بێت ئەو جۆرە تامانە بخوات، ئیتر ترشی بێ یان شیرینی یان تیژی.

پێنجەم: کۆرپەلە لە تەمەنی دوای شەش مانگیەوە لە سکی دایکیدا هەست بە نیگەرانیەکانی دایک ئەکات، واتا ئەگەر دایکەکە لە دۆخێکی دەرونی باش نەبێت ئەویش نیگەرانەو دەم و لچی ئەدات بە یەکدا. کە دایکەکە دڵخۆش بو ئەمیش دڵخۆشەو زیاتر لەوکاتانەدا بە قاچەکانی شەق هەڵدەدات!

**وەرگێڕانی:**
**چالاک بەرزنجی**

---

# شیرپێدانی سروشتی توانای منال زیاتر دەکات



■ نەوژین

**توێژینەوەیەکی نوێ جگە لە سودەکانی دیکەی، جەختی کردوەتەوە لە سودی شیری دایک بۆ بەهێزبون و گەشەکردنی مێشکی منال.**

ئەم توێژینەوەیە کە تیمێک لە پزیشک و توێژەران پێی هەستاون، ئەو منالانەیان خستوەتە ژێر تاقیکردنەوەوە کە زوتر لەوادەی چاوەڕوانکراویان لەدایکبون و ژمارەیان ١٨٠ منال بون.

بەگوێرەی توێژینەوەکە، ئەو منالانەی کە لە ٢٨ هەفتەی سەرەتای لەدایکبونیان شیری سروشتیان پێدراوە، زیاتر لەو منالانەی شیری وشکیان پێدراوە، لەروی توانای مێشکیی و توانستی ئەکادیمییەوە باشتر بون.

توێژینەوەکە چاودێریی ئەو منالانەی کردوە تا تەمەنی ٧ ساڵی، ئاماژەی بەوەکردوە ئەو منالانەی شیریی دایکیان وەکو سەرچاوەی خۆراک پێدراوە، زیاتر لەوانی دیکە زیرەک ترن، هەروەک بەدەستهێنانی توانستی ئەکادیمیشیان زیاتر بوە.

توێژەران مێشکی منالەکانیان لەرێگەی تیشکی لەرینەوەی موگناتیسی خستبوە ژێر چاودێرییەوە، بۆیان دەرکەوتبو کە ناوچەیەکی خۆڵەمێشی لەسەر وێنەی مێشکیان لە تیشکەکەدا، بەردەوام گەشەیان کردوە، لەروی واقیعیشەوە، ئەو منالانە توانای فێربونی زمان و بیرکاریی و ئاستی فێربونیان باشتر بوە.

هەربۆیە ئەو توێژەرانە، رێنمایی دایکانیان کردوەتەوە لە گرنگیی پێدانی شیری خۆیان بە منالان، بەتایبەت ئەو منالانەی زوتر لەدایک دەبن.

# یەک شۆک و دەیان پرسیار



> یاسا بۆ بێدەنگ دانیشتوەو ئەم هەمو ئەتکە بەرامبەر بە مافی مرۆڤەکان دەکرێت؟

■ گوڵباخ حەسەن

**لەگەڵ گەشەکردنی لایەنەکانی ژیان، جۆری ئەو هەڕەشانەشی کەلەسەر ژنانن، گەشەدەکەن و پەرە دەسێنن، بەشێوەیەک کە زۆرجار گوێبیستی جۆری هەڕەشەکان دەبین، رەنگە سەرمان بسوڕمێت و توشی شۆک بین. ئەگەر جاران ژنان روبەروی هەڕەشەی روبەرو و دەستدرێژی و ئازاردانی دەرونی و ئیستیغلالکردن بوبێتنەوە، ئەوا ئێستا روبەروی ئەشکەنجەدانیان لەروی تەکنۆلۆژییەوە دەبنەوە.**

ژمارەی ئەو ژنانەی دەبنە قوربانی هەڕەشەکانی تەکنۆلۆژیا لە کوردستان و گەرمیان بەتایبەتی، تادێت زیاتر دەبێت، زیادکردنێکی ناسروشتی، زیادکردنێکی مەترسیدار.

بەپێی راپۆرتەهەواڵێکی رۆژنامەی (نەوژین) لە ژمارەی رابردوی دا، لەناو هەمو تاوانەکان، تاکە دو تاوان کە لەگەرمیان و بەوتەی پۆلیس زیادیان کردبێت، دزییکردن و تاوانەکانی پەیوەندیدار بە ئامێرەکانی پەیوەندیکردنن، بەتایبەتی ئەمەی دواییان ئەم دو سێ ساڵەی رابردو بەرادەیەکی بەرچاو و مەترسیدار زیادی کردوە، زۆرینەی ئەو تاوانانەش کە کراون، ژنان تیایاندا بونەتە قوربانی.

لەئێستاداو لەگەڵ پەرەسەندنی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، رێژەی ئیستغلالکردنی کچان و ژنان بەدیارییکراوی کچانی هەرزەکار، حاڵەتێکە کە پەل بۆ ئەوەدەکێشێت ببێت بە دیاردە، بەتایبەتی کە هەندێکجار ئەو کارە لەلایەن گروپێک لە پیاوان و کوڕانەوە دەکرێت، واتا مەسەلەکە وەکو باندی تاوانکاریی پێهاتوە، کە ئەو باندە هەڵدەستن بە ئیستغلالکردنی کچان و هەڕەشەی بڵاوکردنەوەی وێنەو نامەکانیان ئەگەر پارەیان پێنەدرێت!

بەڵام لەم ماوەیەدا، جۆرێکی تر لە تاوانی تەکنۆلۆژی یان ئیلیکترۆنی زیادی کردوە، کە لە قێزەونیی دا، رەنگە هاوتای نەبوبێت لەناو ئەو تاوانانەی کەلەو بوارەدا ئەنجام دراون و دەدرێن، ئەویش بەکارهێنانی گرتەی ڤیدیۆیی ژنانە لەلایەن هاوسەرەکانیانەوە بۆ ناچارکردنیان بە ملدان بۆ داخوازییەکانیان!

لەم ماوەیەی رابردودا، ژنێک پاش ئەوەی زانی وەکو چالاکوانێک لەبواری ژنان کاردەکەم، پەیوەندی پێوەکردم و دەردەدڵی خۆی بۆ باسکردم، ئاماژەی بەوەکرد کە مێردەکەی متمانەی ئەمی قۆستۆتەوەو هەستاوە بەگرتنی وێنەی روتی ئەو، ئەم وێنانەشی بەکارهێناوە لە دژی.

کە گوێبیستی ئەم حاڵەتە بوم، توشی سەرسوڕمان بوم، بەڵام شۆکی راستی ئەو کاتە لێی دام کە بەدواداچونم بۆ ئەم حاڵەتە کرد و بۆم دەرکەوت ژنی دیکەش هەن کەبەهەمانشێوە بوبن بە قوربانی. ژنان گەلێک مێردەکانیان هەڕەشەیان لێکردون ئەگەر بەداواکاری تەڵاق بەبێ مارەیی، یان هێنانی ژن بەسەریان دا رازیی نەبن، ئەوا وێنەیان بڵاو دەکەنەوە!

من لەروی رۆژنامەوانیەوە، ئەم بابەتە دادەنێم بۆ راپۆرتێک کەلە ژمارەکانی ئایندەی (نەوژین) دا دەرفەت هەبێت بڵاوی دەکەمەوە، بەڵام ئەوەی دەمەوێت قسەی لەبارەوە بکەم، ئەوەیە کە بۆچی خێزانەکانمان بەم حاڵ و ئاستە گەیشتون؟ بۆچی لەبری ئەوەی خێزان چوارچێوەیەک بێت بۆ خۆشەویستی، کەچی دەبێتە چوارچێوەیەک بۆ رق و کینە؟ چی وادەکات لەبری ئەوەی پەیوەندیەکانمان رایەڵەکانیان متمانە بن کەچی دەبنە ئیستغلال؟

دەبێت ورد تر بوەستین: ئەم هەمو کێشە قورس و شۆکە کۆمەڵایەتییانەی روبەروی دەبینەوە، ئەم هەمو فرت و فێڵە لە پیرۆزترین جۆری پەیوەندی کە هاوسەرگیرییە، بۆ؟

کێیە تاوانباری ئەم رەوشە؟ ئێمەی مرۆڤ یان کۆمەڵگە یان سیستەمی پەروەردەو سیاسییمان؟

لەهەموشی گرنگتر، ئەی یاسا کە بڕیارە کێشەکانی نێو کۆمەڵگا عادیلانە چارەسەر بکات، بۆ بێدەنگ و کڕ دانیشتوەو لەپێش چاویەوە ئەم هەمو ئەتکە بەرامبەر بە مافی مرۆڤەکان دەکرێت؟

کەی ئەو سوێندەی کە هاوسەرەکان لەکاتی ئەڵقە کردنە پەنجەدا خواردیان کە پارێزەری یەکتری و داپۆشەری «شەرم و حەیای یەکتری بن»، گۆڕان بەهەڵدەرەوەی شەرم و بردنی حەیای یەکتری؟

ئەم حاڵەتە یەکێکی ترە لە ئەڵقەکانی زنجیرەی کۆتایی نەهاتوی تاوان و پێشێلکاریەکانی پیاوان بەرامبەر بە ژنان، یان بەشێکە لەو عەقڵیەتەی کە هەموشتی بۆ پیاو حەڵاڵکردوە، بە بڵاوکردنەوەی وێنەی روتی هاوسەرەکەیشیەوە؟








# کەمی بەشداری ئافرەتان لە کایە رۆشنبیرییەکاندا



> ناشارەزایی ئێمە لە ئاین وایکردوە ئاین بکرێتە بیانوی ئەو ستەمەی لە ئافرەت ئەکرێت

> بەشدارینەکردنی ئافرەت ئیفلیج بونی گەشەی رۆشنبیری لێدەکەوێتەوە

■ نزا محەمەد

**بێگومان گەشەی شارستانی بەبێ بەشداری ئافرەتان وەک ئەو کەشتییەیە کە کەشتیوانەکەی تەنها سەوڵێکی پێیە و دواتریش ناگاتە مەنزڵ و بەلارێدا ئەڕوا، رۆڵی ژن چەندە بە گرنگ زانراوە لە گەشەی شارستانییەتەکاندا، بێگومان بەشداریکردنەکەی لە جموجوڵە رۆشنبیرییەکاندا لەوە گرنگترە، چونکە بنەمایە بۆ روودانی گەشەی شارستانی. ناکارایی ئافرەت لە کایەی رۆشنبیریی و مەعریفیدا دەیان هۆکاری خودی و بابەتی هەیە کە شایەنی هەڵوێستە لەسەرکردنن.**

بێگومان هۆکار زۆرن بۆ هەر گرفتێک هۆکاری زۆر هەن، بەڵام ئەوەی ئەتوانین تیشکی بخەینە سەر تەنها گرنگترین هۆکارەکان وەگەر نا هۆکارگەلی خودی و بابەتی تر زۆرن، لەوانە:

١. نەبونی هۆشیاری بەرامبەر خود لەلایەن ئافرەتانەوە، بەداخەوە تا ئێستاش ئافرەتی کۆمەڵگای ئێمە ئەرک و مافی خۆی نازانێت وە نازانێت لەم زەمین و زەمانە چی ئەوێ!

٢. عەقڵییەتی داخراوی پیاو سالاری، کە پێی وایە ئەبێ سنوری ئافرەت دەرگای چێشتخانەی ماڵەکەی بێت نەک هۆڵێکی رۆشنبیری و کتێبخانەیەک، پێی وایە ئەبێ هەمیشە ئافرەت سەرقاڵی هێنان و لابردنی دەفرەکانی سەر سفرەیەک بێ، نەک سەرقاڵی چنینەوەی وشەکانی دو توێی کتێبێک.

٣. نەبونی رۆحی بەپرسیارێتی لای ئافرەتانی کۆمەڵگای کوردی و بەتایبەت گەرمیان، کە پێیانوایە وەک چۆن لە زۆرێک لە شتەکانی ژیاندا پیاوێک لە جێگەی ئەوان بڕیاری داوە لە کایە رۆشنبیرییەکەشدا پێویستە پیاو هەڵگری دەنگ و رەنگی ئافرەت بێت! وەک بڵێی بەشێک نین لەم کۆمەڵگا چی بەسەر کۆمەڵگا دێت با بێت، تەنانەت لە دەمەتەقێی بەردەرگاکانیشیاندا باسی ناکەن.

٤. ناشارەزایی ئافرەتی ئێمە لە ئاین، وایکردوە هەمیشە ئاین بکرێتە بیانوی هەمو ئەو ستەمەی لێی ئەکرێت، رۆڵگێری سەرەکی لەم خراپ بەکارهێنانەدا ئەو پیاوانەن کە بە دوای بیانویەکدا ئەگەڕێن تا ئافرەتانی چواردەوریان سەرکوت بکەن.

بە بەشداری ئافرەت لە کایەی رۆشنبیریدا کۆمەڵێکی زۆر لە زامەکان چارەسەر ئەبن، بەوپێیەی ئافرەت حەکیمێکە زۆرێک لە دەردەکان بە دەستی ئەو دروست دەبن و هەر بە دەستی خۆشی چارەسەر ئەکرێن:

١. ئەگەر ئافرەت بەشداری ئەو جموجوڵە رۆشنبیریانە بکات کە هەن , بێگومان ئەبێتە نوێنەری خۆی و رەنگ و دەنگ و ئارێشەی ژن وەک خۆی ئەناسێنێ، بونی ژن بۆ خۆی رێگرە لەبەردەم ئەوەی دەنگێکی دەستکرد، رەنگێکی دەستکرد و پەیکەرێکی جوانی ناخ بەتاڵی بۆ دابتاشرێ .

٢. رۆشنبیربونی خودی ئافرەتان، کە کۆڕێکی رۆشنبیری سازئەکرێت سەبارەت بە ئەرک و مافی ئافرەت، ئامادەگی هەر ئافرەتێک بێگومان سودی پێدەگەیەنێت.

٣. بەردەوامی کەس و لایەنە خەمخۆرەکانی پرسی ئافرەت، ئێمە کە لە بواری ئافرەتدا هەنگاوێکمان ناوە بێگومان بەشداری ئافرەتان هۆی گەرم و گوڕی و بەردەوامیمانە وهەندێکجار وا هەستەکەم ئافرەتی ئەم کۆمەڵگەی ئێمە هەر ئەمەی ئەوێ و هیچیتر! ئەیەوێ حازر خۆری بەر سێبەر بێت.

دەرەنجامی بەشدارینەکردنی ئافرەتان:

١. ئیفلیج بونی گەشەی رۆشنبیری یەکێک ئەبێ لە دەرەنجامە سەرەکییەکانی بەشدارینەکردنی ئافرەت، چونکە ئەستەمە پیاوێک بتوانێ دیدی پیاو بونی خۆی بەلاوەبنێت و بێت لە گۆشە نیگای ژنێکەوە گوزارشت لە خەمی ژن بکا.

٢. وەک چۆن بەشی ژن لە رابردودا بە شێوەیەکی نائاگایانە خوراوە بەڵام لە ئێستادا نائاگاکراوە و بەشی ئەخورێ و ئەکرێتە بوکەڵە، هەر رۆژە و پەیکەرێکی بۆ ئەتاشن!

بۆیە بەشداری ئافرەتان لەکایە رۆشنبیرییەکاندا پێویستە تا جارێکی تر نەکرێنەوە کاڵا و نان و پیاز بە پرس و گرفتەکانیانەوە نەخورێ، بەشداریکردنەکەش بەشێوەیەکی هاوسەنگ بێت تا رۆڵی سەرەکی و یەکەمینی نەبێتە قوربانی لە پێناوی ئەرکێکی تر.

# شیرپەنجەو شیرپەنجەی مەمک، هۆکار و چارەسەر

## دیدار لەگەڵ (د. بژار ئەحمەد) پزیشکی تیشک و سۆنار

■ نەوژین، سۆزان خەلیل

**شیرپەنجەو بەدیارییکراوی شیرپەنجەی مەمک، یەکێکە لەو نەخۆشیە مەترسیدارانەی کەلەماوەی چەند ساڵی رابردودا، رێژەکەی لە کوردستان و گەرمیان روی لەهەڵکشان کردوە، لەبەرامبەریشدا هۆشیاریی و ئاگاییەکی وەها لەلای ژنان دا نییە کە ببنە بەربەست لەبەردەم تەشەنەکردنی ئەو نەخۆشیە.**

بۆ ناساندنی زیاتری ئەم نەخۆشیەو رێگاکانی خۆپارێزی لێی، (نەوژین)، ئەم دیدارەی سازداوە لەگەڵ (د. بژار ئەحمەد)، پزیشکی تیشک و سۆنار.

* بەشێوەیەکی گشتی نەخۆشی شیرپەنجە چیە؟
شیرپەنجە بەشێوەیەکی گشتی مانای دروست بونی چەند خانەیەکی زیادە لەناو لەشی مرۆڤ کە دەبێت هۆی دروست بونی زیادە گوشتێک یان تێکدانی خانە ئاسایەکانی تری لەش بەهۆی تێک چونی پرۆسەی دابەش بونی خانەکان بەشێوەیەکی ئاسایی کە دو جۆر هەیە بەشێوەیەکی گشتی: جۆرێکی خراپە کە بڵاو ئەبێتەوە، جۆرەکەی تر کە لەشوێنی خۆیدا دروست ئەبێت و بڵاو نابێتەوە.

* شیرپەنجە بەپێی جۆرێتی چەند جۆرە؟ واتە یەک جۆرە یان زیاتر؟
یەک جۆر نییە بەڵکو چەند جۆرێکە، هەیە بڵاو نابێتەوە و هەیە جۆری خراپە و بڵاودەبێتەوە بۆ ئەندامەکانی تری لەش .

* کەسی توشبو چۆن بزانێ توشی شیرپەنجە بوە بەتایبەت مەمک، واتا نیشانەکانی چین؟



بەشێوەیەکی گشتی ئەم نیشانانەی هەیە:
١. بونی گرێ لەناو مەمک کە ئازاری نییە یان هەندێک جار ئازاری ئەبێ.
٢. خوێن کە لە مەمک دێت.
٣. ئەگەر گۆی مەمک چوبێتە ناوەوە کە پێشتر وا نەبوە.
٤. ئەستور بونی پێستی مەمک کە لە شێوەی توێکڵی پرتەقاڵ دا ئەبێت یان سور بونەوەو خورانی پێستی مەمک.
٥. یان لە حاڵەتی ئەو نەخۆشیانە پشتگوێی دەخەن نیشانەی بڵاوبونەوەی شیرپەنجەکە بە لەشدا ئەبێت.
٦. مەرج نیە ئەم نیشانانە کە هەبو ئیتر شیرپەنجەی هەبێت چونکە لە نەخۆشی تریشدا رو ئەدات کە شیرپەنجە نییە، بەڵام ئەگەر هەبو ئەوا زو سەردانی پزیشکی پسپۆر دەکات بۆ ئەوەی دڵنیای بکاتەوە کە نەخۆشیەکەی چیە و چارەسەری گونجاوی بۆ دادەنێت.

* هۆکاری بۆماوەیی تا چەند رۆڵ ئەبینێت لەم نەخۆشیە واتە لە خێزانەوە مرۆڤ توش ئەبێت؟
هۆکاری بۆماوەیی لەلای (٥-١٠٪) نەخۆشەکان بە هۆکاری سەرەکی هەژمار دەکرێت، ئەوانی تر هۆکاری دیکەی هەیە.

* راهێنان و وەرزشکردن تا چەند گرنگە بۆ دور بون لەم نەخۆشیە؟
وەرزش زۆر گرنگە بۆ کەم کردنەوەی لەش کە ئێستا بە هۆکارێکی گرنگ دادەنرێت لە شیرپەنجەی ئەندامەکانی لەش وەکو: (کۆڵۆن و مەمک)، هەروەها وەرزش ئەبێتە هۆی زیاد بونی بەرگری سروشتی لەش.

* پێویستە ژنان چی بکەن بۆ دور بون لەم نەخۆشیە و ئەبێت چ رێوشوێنێک بگرنە بەر و چۆن خۆیان بپارێزن ؟
بەگرتنبەری ئەم رێگایانە، ژنان تارادەیەکی زۆر خۆیان لەو نەخۆشیە دەپارێزن:
١. خواردنی تەندروست.
٢. کێشی لەشی ئاسایی، واتە قەڵەوی باش نییە .
٣. وەرزشی بەردەوام.
٤. پشکنینی بەردەوام لەلایەن پزیشک، ئافرەتەکان خۆیان هەستیان بەهەر شتێک یان گرێیەک کرد لە سنگیان دەبێت سەردانی پزیشک بکەن.
٥. دور کەوتنەوە لە جگەرەکێشان و خواردن و خواردنەوەی ناتەندروست.
٦. ئەو کەسانەی کە کەسێکی نزیکیان وەکو دایک یان خوشک شیرپەنجەیان هەبێت ئەبێت پشکنینی پێشوەخت لای پزیشکی پسپۆر ئەنجام بدەن، چونکە هۆکاری بۆ ماوەیی رۆڵی گرنگی هەیە.
٧. دورکەوتنەوە لەهەندێ دەرمان کە پێویستە تەنها بە رێنمای پزیشک بەکار بهێنرێت.
٨. شیرپێدانی سروشتی، چونکە هەر ژنێک کە شیری خۆی دابێت بە منالی خۆی بۆ ماوەی ساڵێک زیاتر ئەگەری توش بون بە شیرپەنجەی مەمک کەمترە.
٩. سەردانی پزیشکی تایبەت لە کاتی هەست کردن بەهەر شتێکی گومان لێکراو لەناو مەمک یان ئەگەر ئەو مەمکە خوێنی لێ بێت .

* تا چەند ئەو ئافرەتانەی سەردانتان ئەکەن پێویستیان بە پشکنینی ورد هەیە؟
هەمو ئەو ئافرەتانەی کێشی مەمکیان هەیە پێویستە سەردانی پزیشکی پسپۆری نەشتەرگەری بکەن ئەوەش لە ئەنجامی پشکنین بریار ئەدات کە بینێرێت بۆ سۆنار یان تیشکی مەمک یان MRI بەپێی بریاری پسپۆرەکە.

* ئایا ئەو پشکنینانەی ئەکرێ ١٠٠٪ ئەنجامەکەی دەردەکەوێت؟ واتە دەتوانن جۆری نەخۆشیەکە دیاری بکەن؟
ئەو پشکنینانەی ئەنجام ئەدرێ بۆ دۆزینەوەی هەر گرێیەک کە بونی هەبێت پاشان هەندێک جۆری ئەو گرێیانە ئەتوانرێ تەنها بۆ نمونە بە سۆنار دیاری بکرێ وەکو کیسەی ئاو لەناو مەمک، هەندێکی کە پێویست ئەکات پارچەی لێ وەربگرێت بە نەشتەرگەی پاشان زەرعی بۆ بکرێت بەمەبەستی ئەوەی بتوانێت جۆرەکەی بزانرێت و چارەسەری گونجاوی بۆ بکرێت.

---

# بە یەکێک لەم دو رێگایە پێستی رومەتت جوانتر بکەرەوە



■ نەوژین

**هۆکارەکانی رەش بونەوەو خراپبونی پێستی مرۆڤ بریتین لە بەکارهێنانی کرێمی زیانبەخش و دڵەراوکێ و ئاو هەواو تیشکی خۆرو خۆراکی ناتەندروست.**
**هەوڵبدە هەتا بۆت کرا گرنگی بە رێگای سروشتی ببە بۆ پاراستن و جوانتر کردنی پێستت.**

یەکێک لەم دو رێگایەی خوارەوە بەکاربهێنە.
رێگای یەکەم: دو کەوچکی چێشت لە گوشراوی ئاوی پرتەقاڵ لەگەڵ نیو کەوچکە چا لە ئاڵەتی زەردەچۆ تێکەڵ بکە و مەساجی رومەتتی پێ بکە، بەڵام ئاگاداربە نەچێتە ناو چاوتەوە. نزیکەی ٢٠ بۆ ٣٠ خولەک بمێنێتەوە ئینجا بە ئاوی شیلەتێن بیشۆ.
ئەتوانی ئەم رێگایە هەمو شەوێک بەکار بهێنی.
رێگای دوەم: توێکڵی پرتەقاڵ وشک بکەرەوە بیهارەو بیکە بە پاودەر. دوکەوچکی چێشت لەو هاڕاوەیە لەگەڵ دو کەوچکی چێشت لە ماستی سروشتی تێکەڵ بکە و بیخەرە سەر پێستت، بەڵام با بیست خولەک زیاتر نەمێنێتەوە لەسەر پێستت وئینجا بە ئاوی شیلەتێن بیشۆ. ئەم رێگایە لە هەفتەیەکدا جارێک یان دو جار بەکاربێنە . ئەگەر زیاتر بەکاریبێنی زیان بە پێستت ئەگەیەنێ.
ئەگەر ئەم دو رێگایەت بەکارهێنا رەونەقێک بە پێستت ئەبەخشێ و خانە مردوەکانی سەر پێست لادەچێت و پەڵە رەشەکانی لا ئەبات.
ئاگادار بە بۆ رێگای دوەم تەنها ماستی سروشتی ئەبێت بەکاربهێنرێ نەک ماستی کارگەکان، ئەم شێوازەش بۆ هەردو رەگەز دەگونجێ.

و. **لە ئینگلیزیەوە:چالاک بەرزنجی**

---

# دڵەڕاوکێ ژنان تێکدەشکێنێت

■ نەوژین

**توێژینەوە زانستیەکان باس لەوەدەکەن کە ژنان زیاتر لە پیاوان، روبەروی کێشەی تەندروستی دەبنەوە، بەتایبەت لەدڵیان دا، ئەمیش بەوهۆیەی ژنان زۆرتر توشی دڵەراوکێ دەبن و زیاتر کاریگەر دەبن بەو روداو وپێشهاتانەی لە ژیانیان دا رودەدەن.**

شارەزایان لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی ڤیەننا-ی پایتەختی نەمسا، لە توێژینەوەیەکی نوێدا ئاماژەیان بەوەکردوە کە ژنان بەهۆی چەند هۆکارێکەوە، زیاتر لە پیاوان روبەروی مەترسی دڵەخورپە «سەکتە» دەبنەوە، یەکێک لەهۆکارەکانی ئەم حاڵەتەش، زۆربونی دڵەراوکێ «قلق» یە لەلای ژنان.
ئەلیکساندرا کاوتسکی، یەکێک لە ئامادەکارانی توێژینەوەکە، ئاماژەی بەوەکرد ژنان بەشێوەیەکی دروست مامەڵە لەگەڵ دڵەراوکێدا ناکەن، ئەمەش روبەروی کێشەی تەندروستیان دەکاتەوە.
ئەو پزیشکە، نمونەی ئەوەی هێناوەتەوە کە ژنان کاتێک سەرقاڵی کاری ماڵ یان چاودێریکردنی ئەنجدامانی خێزانەکانیان دەبن، یان چاودێری نەخۆشێک دەکەن، ئەوا خۆیان بیردەچێتەوەو زۆر بیریان لای ئەو کارەیان دەبێت و توشی دڵەراوکێ دەبن، ئەمەش فشاریان لەسەر دروستدەکات و کاریگەری لەسەر دڵ و جەستەیان بەگشتی دادەنێت.
کاوتسکی، وتوشیەتی: کەجگە لە نەخۆشیەکانی قەڵەوی و شەکرە، فشارە دەرونیەکانیش بەهۆکارێکی سەرەکی نەخۆشیەکانی دڵ و دڵەخورپە هەژمار دەکرێن.

سەرچاوە: DW

# تایبەتمەندیەکانی ژنانی هۆشیار و سەرکەتو



■ نەوژین

**تائێستا وەک ژنێک بیرت لەو سەرکەوتنانە کردوەتەوە کە بەدەستت هێناوە؟ بەبۆچونی تۆ ژنی سەرکەوتو چی تایبەتمەندیەکی هەیە کە لەژنانی تر جیایان دەکاتەوە؟ ئەگەر وەڵامەکەت بەنازانمە، ئەوا خراپ نیە ئەم وتارە لەبارەی خەسڵەت و تایبەتمەندی ژنانی سەرکەتو و هۆشیار بیخوێنیتەوە.**

*** ژنانی سەرکەوتو دەزانن چیان دەوێت**

ژنانی سەرکەوتو وێنەیەکی رونیان هەیەلەو شتەی کەئەیانەوێ بەدەستی بێنن. چی لەبواری کاربێت یان لەژیانی تایبەتی خۆیان ئامانجی خۆیان دەزانن، بۆ نمونە بەدیاریکراوی دەزانن چەند پارەیان دەوێت، چی جۆرە بارودۆخێکی کاری گونجاویان دەوێت یان دەیانەوێت بەدەستی بهێنن هەروەها بەشوێن پلەی زانستیی و زیاتر برەوپێدانی تواناکانیانەوەن، ئەوەش دەزانن خێزان چی رۆڵێکی هەیەلە ژیانیاندا.

*** ژنانی هۆشیار بەرنامەی رێبەرایەتیان هەیە**

ئەوان هەمیشە بەبەرنامە رێژیەوە دەچنەپێشەوە لەکاتێکدا کەکارەکەیان سەخت دەبێت یاخود دەگاتە بنبەست دەزانن چۆن بڕیار بدەن.

ئێمە هەمومان لەکاتی هەوڵدان بۆ گەیشتن بەئامانجەکانمان روبەڕوی کێشە دەبینەوەو دەزانین کەلەمکاتەدا هەبونی بەرنامەیەکی رێبەری دەتوانێت گاریگەری زۆری ئەرێنی هەبێت.

*** ژنانی سەرکەوتو بەپەرۆشیەوە باجی هەڵەکانیان دەدەن**

ژنانی هۆشیار رێگاکانی بەرژەوەندی پەیدادەکەن تا بەئامانجەکانیان بگەن. ئەوان دەزانن کەناتوانن هەموکەس لەخۆیان رازی بکەن و لەوانەیە هەلەکان بۆ گەیشتن بەخەونەکانیان لەدەست بدەن. بەڵام ئەوان باوەڕیان وایە لەبری ئەوەی بەردەوام لەدودڵیدابن باشترە تەرکیزیان هەبێت و لەهەمو تواناکانی خۆیان سود وەرگرن.




*** ژنانی هۆشیار سەرنج ئەدەن**

ژنانی هۆشیار دەزانن زەمینەو بارودۆخ زو تێدەپەڕێت و دەگۆڕێت ئەگەر ویستێکی بەهێزیان هەبێت بۆ دروستکردنی ئەو گۆڕانکاریە. لەبەر ئەوە کات و بارودۆخە جیاوازەکان بۆئەوان تا ئەندازەیەکی زۆر یەک جۆرەو دەتوانن بەسودی بەرنامەو پلانی خۆیان گۆڕانکاری بکەن.

*** ژنانی سەرکەوتولەیەک خاڵدا نامێننەوە**

ژنانی هۆشیار لەبری ئەوەی هەمو شت بە بەخت بسپێرن یان کات لەدەست بدەن، بەردەوام لە پێشڕەوی و جوڵەدان بۆ پێشەوە. ژنانی سەرکەوتو کاتی خۆیان بەخەمخواردن وپەشیمانی، یان ئارەزوی ئەوەی خۆزگە شتێک جیاواز لەمە روی بدایە بەسەر نابەن. ئەوان بەخۆیان دەڵێن «ئەمە لەوانیە شوێنێک بێت کەمنی لێبم، بەڵام ئەو شوێنەنیەکە حەزم لێیەتی» , چۆن دەتوانم لێرەوە بۆخاڵێکی تر بڕۆم؟

*** ژنانی هۆشیار لە کاتی سەفەردا شاد و پڕ وزەن**

ژنانی هۆشیار دەزانن ژیان چێژ بەخشە. پارە، ئۆتۆمبێل، جلوبەرگ، پەیوەندیەکان و تەنانەت تەندروستی تەواوەتیش ئەگەر خۆشبەتی لەگەڵ خۆیاندا نەهێنن دواجار بەهاو نرخێکی ئەوتۆیان نابێت. ئەوان لەهەر باروخێکدابن ساتەوەختی چێژبەخش وشاد لەپەیوەندیەکانیان دا دروست دەکەن. کەواتەئەگەر چێژ لەژیان نەبینیت و خۆشیەکان ئەزمون نەکەیت، ئەم شتانەهیچ کامێکیان بە کەڵکت نایەت!

***ژنانی هۆشیار گوێ لەدەرونی خۆیان دەگرن ولەگەڵیدا هاوڕان و دەسازێن**

ئەوان دەنگی دەرونی خۆیان دەبیستن و بەگوێرەی ئەوە بڕیارو وەڵام دەدەنەوە، لەهەربارودۆخێکدا بن چ دژوار و سەخت یان خۆشی وئاسودەیی بە پەرۆشیی و باوەڕبەخۆبونەوە گوێیان لەدەنگی دەرونی خۆیانە. ئێمە هەمومان لەهەندێک بارودۆخدا پێچەوانەی ناخی خۆمان کار دەکەین، بەڵام سەرکەوتن لەدەروندایە دەتوانێت دەرئەنجامێکی باشی هەبێت.

*** ژنانی هۆشیار هیچ بیانویەک پەسەند ناکەن**

ژنانی هۆشیار هیچ بیانویەک پەسەند ناکەن، بەڵام ئامادەیی ئەوەیان تێدایە شێوازی بیرکردنەوەیان بگۆڕن لەکاتی پێویستدا. ئەوان بەردەوام لەخۆیان دەپرسن: «ئایا من هێشتا لە رێگام؟ ئایا هێشتا هەر ئەمەم دەوێت؟» ئەم پرسیارانە لەڕاستیدا دەبنەهۆی ئەوەی ژنان بە سود وەرگرتن لەئەزمونەکانیان، ژیانی خۆیان کۆنترۆڵ بکەن. ژنانی هۆشیار بەردەوام پێداچونەوە بەبەرنامەکانیاندا دەکەنەوەو دوبارە دایدەڕێژنەوە.

*** ژنانی سەرکەوتو باوەڕیان بەخۆیان هەیە**

ئەم تایبەتمەندیە وادادەنرێت کەگرنگترین تایبەتمەندی بێت. من هیچ کات نەم بینیوە ژنێکی هۆشیارو سەرکەوتو بڵێت من ئەبێت لەگەڵ هاوسەرەکەم راوێژبکەم بزانم ئەو چۆن بیردەکاتەوە؟ ژنی سەرکەوتو خۆی بڕیاری کۆتایی دەدات.

بێگومان بڕیاردان کاتێک کە تۆ بزانی چیت دەوێت، ئەواهەڵبژاردنی هاوبەشێک بۆ ئەنجامدانی کارەکە زۆر گران نابێت.

**وەرگێڕانی: شۆخان حەمەساڵح**

# 10 ژن کە مێژویان گۆڕیی

■ نەوژین

**١٠ ژن لەمێژودا، بەشداریان کردووە لە گۆڕینی جیهان. هەندێکیان لەبواری سیاسیی دا زۆر بەهێز و کاریگەر بون، هەندێکی تریان، فەرمانڕەوای هەندێک لە گرنکترین وڵات و ئیمراتۆرییەتەکان بون.**

لەم لیستەدا، ناوی ئەو ١٠ ژنە دەخەینە رو، کەهەندێکیان لەسەردەمی تازەو هەندێکی تریشیان لە رابردوی دور دا ژیاون.

**١. شاژنە ڤیکتۆریا:**

بۆماوەی ٦٣ ساڵ فەرمانڕەوایەتی بریتانیای کرد و لەساڵی ١٩٠١ دا کۆچی دوایی کرد. ئەو سەردەمەی کە ئەو فەرمانڕەوایەتی تێداکرد، بە «سەردەمی ڤیکتۆریی» ناوزەد کراوە. لە سەروبەندی فەرمانڕەوایەتییدا، بریتانیا لەزۆر بواردا گەشەسەندنی بەخۆیەوە بینی.

**٢. ئێلینۆر رۆزفێڵت:**

هاوسەری سەرۆکی ئەرمریکا: (فرانکلین رۆزفێڵت) بو. بەوە ناسراوە کەتوانایەکی لەرادەبەدەری لە پێشکەشکردنی گوتار و بەهێزی لە کاری سیاسی دا هەبوە. لەچەندین بۆنەشدا دژایەتی خۆی بۆ سیاسەتەکانی هاوسەرەکەی ئاشکرا کردووە.

پاش کۆچی دوایی رۆزفێڵتی هاوسەری، ئێلنیۆر لەبواری مافەکانی مرۆڤ لەڕێگەی نەتەوەیەکگرتوەکان کاری کردووە، یەکێک بو لەوانەی رۆڵی سەرەکیان هەبو لەهێنانە ئارای «جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ».

**٣. ئۆپرا وینفری:**

راگەیانکاریی ناسراویی ئەمریکی ئۆپرا، خاوەنی تۆڕێکی میدیایی تایبەت بەخۆیەتی. لە خێزان و ژینگەیەکی زۆر هەژار و نەبو دا هاتۆتە بون، بەڵام توانی بە هەوڵە بەردەوامەکانی ببێتە دەوڵەمەندترین ژنی ئەمریکی بەرەگەز ئەفریقی.

ئۆپرا بەیەکێک لە کاریگەرترین ژنانی جیهان هەژمار دەکرێت.

**٤. شاژنە ئەلیزابێسی یەکەم:**

بە شاژنی پاکیزە ناودەبرێت، چونکە لەژیانی دا هاوسەرگیریی نەکردووەو منالّی نەبوە. لەماوەی ساڵانی ١٥٥٨ بۆ ١٦٠٣ فەرمانڕەوای بریتانیا بوە. ژنێکی بەهێز و توند بووە لە بڕیارەکانی دا.

**٥. مارگرێت تاتچەر:**

بە «ژنە ئاسنینەکە« ناسراوە. بۆ ماوەی ١١ ساڵ، سەرۆک وەزیرانی بریتانیا بوەو لەساڵی ٢٠١٣ دا کۆچی دوایی کرد. رۆڵی هەبو لە گۆڕینی سیاسەتەکانی وڵاتەکەی بەشێوەیەکی بەرچاو لە بوارەکانی ئابوری و کۆمەڵایەتی.

**٦. دایکە تیرێزا:**

لەماوەی ساڵانی ١٩١٠ بۆ ١٩٩٧ دا ژیاوە، بە ئەنجامدانی کاری خێرخوازیی و خۆبەخشیی ناسراو بووە. لەبەرامبەر کارەکانی بۆ خزمەتی منالانی هەژار و کەسانی دەربەدەر، خەلاتی نۆبڵی بۆ ئاشتی پێبەخشرا.

**٧. کلیۆپاترا:**

ئەم شاژنە، بەتەنها بە جوانیەکەی بەناوبانگ نەبوە، بەڵکو بە کاریگەریی و هێزیشی لە دەسەڵاتدا. لەماوەی ساڵانی ٦٩ بۆ ٣٠ پێش زاین ژیاوەو لەگەڵ خوشکێکی دا فەرمانڕەوایەتی میسریان کردوە ئەگەرچی هەمیشە ناکۆک بون.

**٨. ماری کۆری:**

یەکەمین ژنە کە دەبێتە خاوەنی خەڵاتی نۆبلأ لە فیزیادا، پاشان هەمان خەڵاتی بەدەستهێنایەوە، بەڵام ئەمجارەیان لە بواری کیمیا.

ماری توانی لەمیانەی توێژینەوەکانی دا، مادەی «پۆلۆنیۆم» بدۆزێتەوە.

**٩. ئێلیانور ئاکیتیان:**

دەوڵەمەندترین و بەهێزترین ژنی ئەوروپی بوە لە سەدەی ١٢ی زاینی. هاوسەرگیریی لەگەڵ پاشای فەرەنسا (لویسی حەوتەم) دا کرد، پاش ١٥ ساڵ هاوسەرگیریی لێی جیابویەوەو دواتر هاوسەرگیریی لەگەڵ پاشای ئینگلتەرا (هینری دوەم) دا کرد. سێ لە کوڕەکانی بون بە پاشا، لەنێویاندا ریچارد کە بە «شێر دڵ» ناسراوە.

**١٠. کاترین دی میدیشی:**

لەتەمەنی ١٤ ساڵاندا هاوسەرگیریی لەگەڵ گەنجێکدا کرد کەپاشان بو بە پاشای فەرەنسا. لەماوەی ساڵانی ١٥١٩ بۆ ١٥٨٩ ژیاوەو بەهێزترین ژنی ئەوروپی بوە لەو دەمەدا. توانیویەتی کاریگەری لەسەر زۆربەی سیاسەتمەدارەکان دابنێت و بڕیارەکانیشی جێپەنجەیان لەسەر ئەوروپا بەگشتی بەجێهێشتوە.



پۆرترێتی شاژنە ڤیکتۆریا

## دەربارەی نەوژین

نەوژین، رۆژنامەیەکی سەربەخۆی تایبەتمەندە بە پرسەکانی ژنان، مانگانە لەلایەن رادیۆی دەنگ لە گەرمیان بڵاودەکرێتەوە.

رادیۆی دەنگ، پرۆژەیەکی میدیایی سەربەخۆیە لە ناوچەی گەرمیان، لە ٢٠١٠ وە بە پەخشی رادیۆیەکی لۆکاڵی دەستی پێکردوەو پاشان وێبسایتێکی داناوە.

رۆژنامەی نەوژین یەکێکە لە چالاکیەکانی پرۆژەی رادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی (NED) ئەمریکی.

رۆژنامەی نەوژین یەکێکە لە چالاکیەکانی پرۆژەیەکی رادیۆی دەنگ کە لەلایەن سندوقەکەوە پاڵپشتیی دەکرێت.

رۆژنامەنوسانی ئەم رۆژنامەیە، ژمارەیەک کچن کەپێشتر خولێکی راهێنانیان لەلایەن رادیۆی دەنگەوە بۆئەنجامدراوەو زۆرینەیان پێشتر کاری رۆژنامەوانییان نەکردوە.

بۆ پەیوەندیکردن بە رۆژنامەکەوە:
تەلەفۆن:
٠٧٤٨٠٢٠٧٤٠٠
ئیمەیڵ:
nawzhinnewspaper@gmail.com
فەیسبوک:
nawzhinnewspaper

دەتوانن لەماڵپەڕی رادیۆی دەنگ کۆپی ئیلیکترۆنی ژمارەکانی رۆژنامەکە ببینن
www.radiodang.org

# کچێک بۆنی مێخەک بەردەداتە گەرمیان







■ نەوژین

**لەپێشانگایەوکی تایبەت دا کچێکی گەرمیانی، یادی یەکێک لەدێرینترین بۆن و بەرامە بەکارهاتوەکانی ئافرەتی کورد و یەکێک لەسەرەتاییترین کەرەستەکانی ئارایشت لە کوردستان دەکاتەوە، کە ئەویش (مێخەک)ە.**

لەقەزای کفری و لە مۆزەخانەی کلتوری شار، (خاتو ئەمیرە) وەکو کچێکی دەستڕەنگین، یەکەمین پێشانگای تایبەتی بە مێخەک کردەوە.

پێشانگاکە کەناوی «مێخەک و بۆنی یاران» بو، لەلایەن هاولاتیانەوە پێشوازیەکی زۆری لێکراو خەڵکێکی بەرچاو ئامادەی بینینی بون.

مێخەک کە لەبنەڕەتەوە روەکێکە، بەوە جیادەکرێتەوە کەخاوەنی بۆنێکی تایبەتی خۆشە، هەربۆیە پاش وشککردنەوەی و گونجاندنی بەچەند قۆناغێک، وەکو بۆن و بەرامە بەکاردەهێنرێت لەلایەن ژنانەوە.

لەکوردەوارییدا، مێخەک وەکو سەرەتاییترین کەرەستەکانی ئارایشت و بۆنخۆشیی لەلایەن ژنانەوە بەکارهێنراوە، بەشێوەیەک ژنان مێخەکبەندیان وەکو ملوانکە دورست دەکرد و لەملیان دەکرد، یاخود لە گیرفانەکانی خۆیان دەناو بۆنەکەی پەرش دەبویەوە.

لەکاتێکدا کە کەرەستەکانی ئارایشت بازاڕیان تەنیەوە، برەوی مێخەک و سمڵ و هاوشێوەکانیان کەمتر بونەتەوە، بەڵام وەک سۆزێک بۆ رابردو و بۆ ئەم بۆنە رەسەنە، خاتو ئەمیرە لەکفری هەستاوە بە کردنەوەی ئەم پێشانگا تایبەتە بە بەمێخەک. لەبارەی مەبەست و ئامانج لەکردنەوەی ئەم پێشانگایە، (خاتو ئەمیرە) وتی: «وەکو حەزێک خۆم حەزم لە مێخەک و مێخەک دروستکردن بوە، ئەم حەزەشم لە خوشکەکانمەوە بۆ بەجێماوە».

> ئەم کارەم بۆ زیندوراگرتنی کەلەپوری نەتەوەکەمانە

وتیشی: «ماوەی سێ ساڵە بەردەوامم لەدروستکردنی مێخەکبەند و خۆشحاڵیشم کە یەکەم پێشانگای لەوشێوەیەم لە شارەکەم و لە مۆزەخانەی کەلەپوری شار کردەوە، بۆ زیندوراگرتنی کەلەپوری نەتەوەکەمان».

# بۆیەکەمجار لەگەرمیان کچێک دەلاکی بۆ پیاوان دەکات

■ نەوژین

**بۆیەکەمجار لەگەرمیان کچێک دەلاکی «سەرتاشیی» بۆ پیاوان دەکات و یەکەم کاریشی بەخۆبەخشانە بەشدارییکردنە لە هەڵمەتێکی سەرتاشین لە کەمپێکی ئاوارەکانی گەرمیان.**



ساراڵ فەتحوڵڵا، ئەو کچەی کە خاوەنی سەنتەری ئارایشتی ژنانە، دەبێتە یەکەم ژن لە دەڤەرەکە کە پیشەی سەرتاشینی پیاوان ئەنجام بدات.

ساراڵ، هەفتەی رابردو لەگەڵ ئەندامانی تیمێکی خۆبەخش لە کەمپی ئاوەکارەنی (ئەڵوەند١) بەشدارییان لە هەڵمەتێکی سەرتاشینی بێبەرامبەر کرد بۆ نیشتەجێبوانی کەمپەکە.

بەوتەی (عومەر عەبدوڵلا)، سەرۆکی رێکخراوی (پەیامی ئێمە بۆ پەرەپێدانی گەنجان)، کە رێکخراوەکەیان بە هاوکاری (سەنتەری ئەژی بۆ جوانکاری پیاوان لەکەلار) هەڵمەتی سەرتاشینەکەی لەو کەمپەدا رێکخستوە، ئەمە دەیەمین هەڵمەتە کە ئەنجامی دەدەن، بەڵام جیاوازی ئەم هەڵمەتە بەشدارییکردنی (ساراڵ) بو لەگەڵیان وەکو یەکەمین ئافرەت کە لەگەرمیان دەلاکی بۆ پیاوان بکات.

وتیشی: ئەمەیەکەمجارە لەگەرمیان ئافرەتێک کاری سەرتاشین بۆ پیاوان بکات و خۆشبەختانەش ئەم کارە بەخۆبەخشی دەستی پێکرد.

باسیلەوەشکرد: ئەوان تاوەکو ئێستا لەکەمپەکانی سنوری گەرمیان کەبریتین لە: (قۆرەتو، تازەدێ، ئەڵوەن١ و ئەڵوەن٢) ١٠ هەڵمەتی سەرتاشینی خۆبەخشانەیان ئەنجامداوە، جگە لە ئەنجامدانی چەندین کار و چالاکی دیکەی خۆبەخشی.

ماوەیەکە هەندێک لە پیاوانیش بەکاری ئارایشتی ژنان هەڵدەستن، بەڵام ئەمە دەبێتە یەکەمجار لە گەرمیان کە ئافرەتێک کاری دەلاکی بۆ پیاوان ئەنجام بدات.

# لەکفریەوە بۆ پاڵەوانی ماراسۆنی نێودەوڵەتی هەولێر

■ نەوژین، بێریڤان محەمەد

**نەکەمی دەرفەت و نە زۆری ئاستەنگەکان، وایان نەکرد (رێناز) لەو خەونەی کەلە بواری وەرزش دا هەیەتی، سارد بکەنەوە، بەپێچەوانەوە ئەم کچە توانیویەتی لەماوەی چەند ساڵێکداو لەرێگەی راهێنانی بەردەوامەوە پەرە بە ئاستی خۆی بدات تا بگات بەوەی ببێت بە ئەستێرەیەکی یاریەکانی گۆڕەپان و مەیدانی کوردستان و عێراق و بەشداری پاڵەوانێتییە نێودەوڵەتیەکانیش بکات.**



رێناز سەعید رەشید، لەدایکبوی ساڵی ١٩٩٦ ی قەزای کفریە، لە ساڵی ٢٠١١وە دەستی بە راهێنان لە یاری گۆڕەپان و مەیدان کردوە و ئێستاش بە شێوەیەکی ئەکادیمی بەردەوامە.

ئەم کچە لەماوەی تەمەنی کەمی وەرزشی خۆیدا، بەشداری لە زۆربەی پاڵاوتنەکانی عێراق و کوردستان کردوەو چەندین پلەو خەڵاتی لەو روەوە بەدەست هێناوە، کە باشترین و کۆتای دەستکەوتی ئەم کچە یاریزانە، بردنەوەی پلەی یەکەم بو لەسەر ئاستی عێراق بۆ یاری گۆڕەپان و مەیدان لە ساڵی ٢٠١٦ دا.

بەردەوام وەرزش بەتایبەت لەگەرمیان، وەکو بوارێکی تایبەت بە رەگەزی نێر ناسراوە. بەبەراورد بە کوڕان، ژمارەی کچانی وەرزشکار کەمن، بەڵام ئەمە وای نەکردوە کە کچانێک پێنەگەن بتوانن جێپەنجەو دەستیان لەم کایەیەدا بنەخشێنن.

رێناز، وەکو کچێک کە لەگەرمیانەوە روی لەم بوارە کردوە، ئەوەی بە (نەوژین) وت: «ئەو بەربەستانەی پێشتر بۆ بەشداریی کچان لە وەرزش دا هەبون، ئێستا کەم و لاواز بون»، بۆیە بە گرنگیی دەزانێت کچانێک کە خولیای ئەم بوارەیان هەیە، پەرە بە خولیاکەیان بدەن.

باسیلەوەشکرد کە ئەو حەز و خولیایەکی سەرەتایی هەبوەو لەسەر بەدیهێنانی ئەو حەزە رۆشتوە، هەتا توانیویەتی بگات بە ئاستێکی باش و باڵا.

> ئەو بەربەستانەی پێشتر بۆ کچان لە وەرزش دا هەبون، ئێستا کەم و لاواز بون

زۆرێک لە کچان کە رو لە بواری وەرزش ناکەن، هۆکاری کۆمەڵایەتی یان خێزانیی، بە رێگر دەزانن.

لەمبارەیەوە رای رێناز جیاواز و پێچەوانەیە، چونکە ئەو باس لەوەدەکات کە تائێستا هیچ رێگرییەکی بۆنەهاتوەتە پێش و چونکە خۆی سور بوە لەسەر پەرەدان بە تواناو خولیاکەی، بۆیە لەروی خێزانیشەوە پشتگیریی کراوە.

رێناز، وتی: «من هیچ بەربەستێکی کۆمەڵایەتیم نەهاتوەتە پێش، بەڵکو خێزانەکەمیش زۆر هاوکارم بون، بەربەست و رێگرییە کۆمەڵایەتیەکانیش ئێستا کەمترن لە جاران».

هەروەک رێنمایی کچانیش دەکات بۆ چونە نێو دونیای وەرزشەوەو دەڵێت: «وەرزش دنیایەکی زۆر تایبەتە هیوادارم دودڵ نەبن و هیچ شتێک بەبەربەست نەزانن و داوای هاوکاری لە کەسانی خاوەن ئەزمون بکەن و لەگەڵ کەسانی پسپۆر و وەرزشی دەست پێ بکەن».




لەبارەی کۆمەکردنی لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە، رێناز بە سوپاسەوە باسیلەوەکرد کە لەسەر دەستی راهێنەرەکەی (د.سیروان حامد)، ئاستی وەرزشیی بەرەوپێشەوەچوەو توانیویەتی سەرکەوتو بێت.

رێناز بە ٢١ ساڵ تەمەنەوە، بەشداری لە زۆربەی پاڵاوتنەکانی عێراق بۆ یاریەکانی گۆڕەپان و مەیدان کردوە، کە لەساڵی ٢٠١٦ بوەتە پاڵەوانی یەکێک لە یاریەکان، لەساڵی ٢٠١٥ دا بەشداریی ماراسۆنی نێودەوڵەتی هەولێری کردوەو پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە. لەئاستی نێودەوڵەتیش، لەساڵی ٢٠١٥ بەشداری ماراسۆنی نێودەوڵەتی لوبنانی کردوە کە ٣٦ هەزار کەس تیایدا بەشدار بون و لە پلەکانی پێشەوە بێت.